# ناسنامەی کتێب

❖ ناوی کتێب: چەپکێك گوڵ لە باخی شیعری کلاسیکیی کوردی
❖ ئامادەکردنی: فەرهەنگ قەرەنی
❖ بابەت: لێکۆڵینەوەی ئەدەبی و عیرفانی
❖ پێداچوونەوەی: عومەر ئیسماعیل
❖ هەڵەگر: باخان ئەحمەد
❖ دیزاینی بەرگ: ئیبراهیم ساڵح
❖ دیزاینی ناوەڕۆک: هونەر عوسمان
❖ قەبارە: ١٤*٢١ سم
❖ ژمارەی لاپەڕە:١٤٥ لاپەڕە
❖ تیراژ: ٥٠٠ دانە
❖ نرخ: ٣٥٠٠ دینار
❖ نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم/٢٠٢٠
❖ شوێنی چاپ: ناوەندی سارا_ سلێمانی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردن(      )ی ساڵی ٢٠٢٠ی پێدراوە

SARA CENTER
BookShop - prenting - cafe

**ناوەندی سارا**
**بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**
**سلێمانی_بازاڕی ئاوباریک_ نهۆمی دووەم_ بەرامبەر کاسۆمۆڵ**

ئەم بەرهەمە پێشکەشە بە:
جگەرگۆشەکانم؛ "نالی" و "مەحوی".

# پێشەکی

ژانـره ئەدەبییـەکان، بەتایبـەت شـیعری کلاسـیکی کـوردی، هـەر بەتـــەنها باســـی بەســـەرهاتەکانی مـــرۆڤ نییـــە و ڕووداوگـــەلێک ناگێڕنـەوە، بـەڵکوو قسـەکردنە لەگـەڵ ئـەودیوی دەقە ئەدەبییـەکان، مەغزا و مەبەستی دیاریکراو دەبەخشنە خوێنەر.

بـــە درێژایـــی مێـــژووی شـــیعری کلاســـیکی کـــوردی، چەمکـــە وجوودییەکان بوونیان هەبووە و شاعیرانی کورد زووتـر دەرکیـان بـە واتاکـانی ژیـان کـردووە و خزاندوویانـە نێـو ئـەدەبیاتی شـیعری کلاسـیکەوە، بەتایبـەت لـە ئـەدەبیاتی عیرفـان و گوتـاری ئاییندا، لـەوێوە خـەون و خولیاکـانی مـرۆڤ ئاوپرژێنـە بەسـەر وشـکەڵانی ڕۆح، کە تیایدا مرۆڤ ساناتر پەی بە جوانییەکانی خودی خۆی و خـودا دەبـات، ئەمـەش پانتاییـەکی فراوانـی لـە ئـەدەبیاتی شـیعری کلاسیکی کوردی داگیر کردووە.

هەندێک جاریش مرۆڤی کلێشـەبەندی لـەناو شـیعری کلاسـیکی کوردیدا دەبینرێت، کە پێویستیی حەتمییان هەیە و قسەگەلێک لەخۆ هەڵدەگرن.

لەگـەڵ ئەوەشـدا گـەڕان بـەنێو کـونج و کەلەبـەرەکانی شـیعری کلاســـیکیی کـــوردی، بەرپرســـیارییەتییەکی مێژوویـــی هـــەیـــە و ڕیشەیەکی ئەخلاقی وەردەگرێت.

لـــە بـــارەی شـــیعری کـــوردی، بەگشـــتی وەهـــا عـــادەتم گرتـــووە زۆربەی جار کە شیعر دەخوێنمەوە، لەگەڵ سات و بارودۆخەکاندا شیعری شاعیرەکان لەگەڵ خۆیان دەمبەن...

شەوێکی مەلەکووتیی کپ و سکونەت دەمباتە بەر نەرمەبارانی "مەحوی" و بە "نووری بادە" تەڕ تەڕ دەبم.

"نالی" بێ ئەوەی سات بناسێت، پرچی حەبیبەکەی خۆمم دەداتە دەست و پەنجەکانم دەبێتە شانەی شیعر.

لەناو شیعرەکانی وەفایی و سالم و کوردی و حەریق و حەمدی و ناری و... هتد، چرای دەیجووری ژیان هەیە و هەردەم چرۆ بە داری هیوا دەبەخشنەوە.

کە غەم دامدەگرێت، "هێمن" بەهێمنی دێتە ناو ڕۆحم و لەجیاتیی من دەڵێت:

**بولبوولی باڵ شکاوی وەختی گوڵم**
**هەر شەپۆلان دەدا دڵی لەکوڵم**

کە پاییز هات، یانی دووبارە و چەندبارە هەڵدانەوەی ژێر دەواری دێڕ بە دێڕی دیوانە بچکۆلانەکەی "ژەنەڕاڵی پاییز"، گەڵا بە گەڵا لەگەڵی هەڵدەوەریم.

لە سەروبەندی کێشمەکێشمەکان و ونبوونی ئیرادەدا، دەچمە سەنگەری "عەبدوڵڵا پەشێو" و هاواری "نا"م لێ بەرز دەبێتەوە.

جانتای سەفەرم پڕە لە بۆنی ناو "پاسە شینەکە"ی "هیوا قادر"...

لە زیکری نیشتماندا، "شێرکۆ بێکەس" لە "دەربەندی پەپوولە"دا دەوەستێت و دەیەوێت بڵێت: "والا بە..."

لەولاشەوە "تەڵعەت تاهیر" دەبینم وەک نەورەسێکی سپی لەسەر منارەی مزگەوتێکی هەولێر، ئارام نیشتووە و جوانی دەنووسێتەوە.

بە "باڵی حیکمەت"ی "بەختیار عەلی" دەفڕم، تا دواجار دەبێتە مارشی نیشتمانیی ڕۆحی من.

ئیدی ئەمانە و چەندانی تر، بەملا و ئەولای لاپەڕەکانی دیوانە کوردییەکاندا دەمهێنن و دەمبەن.

خوێنەری ئازیز، ئەم کتێبە ئاڕاستەکەی ڕووەو نەوەی نوێیە کە سەروسەودایان لەگەڵ ئەدەبیات و بەتایبەت ژانری شیعردا هەبێت. هەوڵێکە بۆ ئاشنایەتیمان بە شیعری کلاسیکی کوردی هەڵدانەوەی چەند لایەن و دیوێکی دیوانە کوردییەکانە.

بێگومان کۆی گشتیی ئەم نووسینە بەبێ کەموکوڕی نابێت، بۆیە داوای لێبوردن لە ڕۆحی بەرزی شاعیرەکان و خوێنەر دەکەم. ئومێدەوارم هەم سوودی زانستییانەی هەبێت و هەم چێژبەخش بێت.

بەپێویستی دەزانم سوپاسی هەموو ئەو کەسانە بکەم یارمەتی و هانیان داوم.

فەرهەنگ قەرەنی

٢٠١٩

هەولێر - باشووری کوردستان

# بەشی یەکەم
# قووڵبوونەوە لە شیعر

## شیعر چییە؟

شیعر یەکێکە لە سەرەکیترین ژانرە ئەدەبییەکان، لە باوترین پێناسەیدا بریتییە لەو ڕێنیشاندەرەی چاوساغی دەکات تا بتوانرێت بەنێو ڕێگاکانی ناخ و دەروونی مرۆڤدا شۆڕ بێتەوە و هاتوچۆ بکات و پەی بە کونج و کەلەبەرەکانی ناخ ببرێت کە لەمەوبەر پێی ئاشنا نەبووین، سەرەنجام جیلوە دەداتە وجوودیەتی شاعیر و تا دواجار لەژێر ناونیشانێک دەبێتە دەقێکی ئەدەبی.

بە واتایەکی تر: شیعر هەڵقوڵاوی شعوری مرۆڤە کە جیاواز لە ئەوانی تر، ئەودیوی شتەکان دەبینێت و دەرک بە ڕووداو و بەریەککەوتن و پەرچەکردارەکان دەکات.

شیعر دەنگدانەوەی کاریگەری واقیعی ژیانە، بۆچوونی مرۆڤە بەرامبەر بە کاریگەرییەکان.

وە هەندێک جاریش بە تەرجومانی دڵ ناوی دەبرێت و بەرهەمی مرۆڤێکی بەهرەداری بەئەندێشەیە.

بەڵام بەگشتی پێناسەیەکی دیاریکراو و جێگیر نییە بۆ ئەو ژانرە ئەدەبییە، چونکە بەپێی سەردەم و قۆناغە ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتییەکان وەک هەر کایەیەک لە کایەکانی ژیان؛ گۆڕانی بەسەردا دێت، بەتایبەتییش کە شیعر پەیوەستە بە ناخی زاتی

مرۆڤ و بەمەش دۆخێکی لاستیکی و ناجێگیر وەردەگرێت و لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیا دەکرێتەوە.

## شاعیران کێن؟

بەو کەسە دەڵێن کە توانای هەیە شیعر بنووسێت یان بیڵێت و لە ناخی خۆیەوە هەڵقوڵابێت، هەروەها بەهرەی ئەوەی هەبێت مامەڵەیەکی ئەدەبییانە لەگەڵ وشە بکات و بیانخاتە ڕستەی ئەدەبییەوە. هەڵبەت بەپێی هەلومەرج و سەردەم و قۆناغەکان، گۆڕان بەسەر پێناسەی شاعیریش دێت، وەک چۆن شیعر پێناسەیەکی جێگیری نییە و ناشیبێت، چونکە ئەرکی شاعیر لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر و لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر دەگۆڕێت.

بۆ نموونە: ئەگەر میللەتێک لە جەنگ و بەرگریکردن لە خاک و نیشتیماندا بێت، ئەرکی شاعیر پەیوەست دەبێت بەوەی شیعری نیشتیمانپەروەریی پڕ هەیەجان بنووسێت و بڵاوی بکاتەوە، بەمە هانی خەباتکار و جەنگاوەرەکان بدات بۆ زیاتر نەبەردی و خۆڕاگری و ورەبەرزی. ئەمما لە کاتی ئاشتی و فەراهەمبوونی ئاسایشی نیشتیمانییەوە، ئەرکی شاعیر ئەوەیە جوانناسیی ژیان بخاتە ڕوو و تابلۆی ئەدەبی و قووڵایی "بوون" بنووسێتەوە و ئیستاتیکا بداتەوە ژیان.

## چی لە بارەی شیعرەوە وتراوە؟

ئەفلاتوون: "شیعر لاساییکردنەوەی سروشتە."
هۆراس: "شیعر وێنەکێشانە."
سیمۆندیس: "وێنەکێشان شیعرێکی بێدەنگە، شیعریش وێنەیەکی دەنگدارە."
ڕیتشارد هێرد: "شیعر هونەرێکە مەبەستی ئەنجامدانی گەورەترین چێژبەخشینە بە گوێگر."
وردزورپ: "هەڵچوونێکی خۆیی سۆزە بەهێزەکانە."
ستیوارمیل: "شیعر دەربڕینی سۆزە."
هێردەر: "ئەنجامی غەریزە هاوبەشەکانی مرۆڤە بۆ نەشونماکردنێکی سروشتی لە هەموو ڕەگەزەکاندا و هەڵقوڵینێکی زیندووی هەست و سۆزەکانە."
قودامە بن جەعفەر: "شیعر ئاخاوتنێکی کێش و سەروا و واتادارە."

شێخ محەمەدی خاڵ: "شیعر 'وەحی'ێکی دەروونییە، لە ئاسمانی مێشکەوە بە هۆی فریشتەی بیرەوە دێتە خوارێ بۆ سەر زمان و قەڵەمی شاعیر."

# مێژووی شیعر

تا ئێستا بەدروستی کەس مێژووی شیعر نازانێت، بەڵکوو ئەوەی هەیە زۆرێک لە ڕاکان پێیان وایە مێژووی ئەم ژانرە ئەدەبییە لەنێوان (١ تا ٥ هەزار ساڵ) پێش زایین دەگەڕێتەوە. گاتاکانی زەردەشتیش سەر بە ڕابردوویەکی زۆر کۆنن.
بەگشتی ئەم بەرهەمانە کۆنترینن کە ناویان بە نەمری مابێتەوە:
لە یۆنان، ئیلیادە و ئۆدسیۆسی هۆمیرۆس.
لە هیندستان، مەهاباراتا و ڕامایانا.
لە ئێران، شانامەی فیردەوسی.
لە کوردستان، مەم و زینی ئەحمەدی خانی.
لە سۆمەرییەکان، داستانی گلگامش.

هەندێکیش پێیان وایە مێژووی شیعر دەگەڕێتەوە بۆ پێش نووسین و هەر لەو کاتەوەی مرۆڤ توانای بیرکردنەوەی پەیدا کرد و توانای ئەوەشی پەیدا کردووە ڕۆبچێتە ناو ئەندێشە و خەیاڵاتەوە و قووڵ ببێتەوە و گۆرانی بڵێت و قسە بکات و ڕێکییەک بداتە قسەکانی.

## ڕەهەندە گشتییەکانی شیعر ئەمانەن

لە ڕەخنەی ئەدەبیدا شیعر بەسەر چەند ڕەهەندێکەوە تەوزیف کراوە و مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، وەک ئەمانەی خوارەوە:
١. لە ڕووی زمانەوانییەوە.
٢. لە ڕووی مێژووی ئەدەبییەوە.
٣. لە ڕووی دەروونناسییەوە.

٤. لە ڕووی کۆمەڵناسییەوە.

## ڕەگەزە بنچینەییەکانی شیعر ئەمانەن:

١. سۆز
٢. ئەندێشە و خەیاڵ
٣. بیرۆکە
٤. زمان
٥. وێنەی شیعری
٦. هێما
٧. سێبەر
٨. کێش و مۆسیقا
٩. سەروا
١٠. مانا
١١. داڕشتن
١٢. خاڵبەندی

## بەشە سەرەکییەکانی شیعر ئەمانەن:

**١. ڕووخساری شیعر**

کە ئەویش دابەش دەبێتە سەر ئەمانە:

أ. وشە
ب. ڕستە
ج. داڕشتنی گشتی

**٢. ناوەرۆکی شیعر**

# پۆلێنکردنی شیعر

## ١. شیعری کۆن

بەو شیعرانە دەوترێت کە لەسەر زەمینەی ڕەسەنایەتییەوە، گوتراوە مێژوویەکی یەکجار کۆنیان هەیە و ڕەگوڕیشەدارن و بەگشتی بە شیعری کلاسیک و عەرووز و کێش و سەروادار ناویان دەبرێت.

## ٢. شیعری نوێ

بەو شیعرانە دەوترێت کە ڕەگوڕیشەکەی لە خۆرئاواوە هاتووە و لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا گەیشتە لای ئێمە. شیعری ڕەها یان ئازادیشی پێ دەگوترێت، گوێ بە هیچ جۆرە چوارچێوە و ڕێسایەکی شیعری پێشوو نادات. ئەوەی مەبەستم بێت لەم کتێبە باسی بکەم، باسی شیعری کۆنە (کلاسیک).

وشەی کلاسیک بۆ یەکەم جار لەلایەن "ئولیوس جلیوس"ی نووسەری لاتینیی سەردەمی سەدەی دووەمی زایینی بەکار هاتووە، پێی وا بووە هەر ئەدەبێک بایەخ بە پوختەی وشە و پتەویی واتا بدات، ئەوە ئەدەبی کلاسیکە.

وشەی کلاسیک لە وشەی پۆل، یان "الصنف"ەوە وەرگیراوە، چونکە ئەدەبێکە پۆل و پرۆگرامی هەیە و چوارچێوەدارە.

هەندێکی تریش وای بۆ دەچن لە وشەی لاتینییەوە وەرگیراوە کە بە واتای بەرزترین چینی کۆمەڵگەی ڕۆمانی دێت، لەمەشیاندا بەرزترین جۆری ئەدەبە لە ڕووی زمان و واتا و پرۆگرامەوە کە شایستەی چینی ڕۆشنبیرانی کۆمەڵگە بێت.

# بەشی دووەم

# ئایا "شیعر" و "هۆنراوە یاخود هەڵبەست" جیاوازن؟

وشەی شیعر و هۆنراوە یاخود هەڵبەست، بە تەواوی ماناوە لە یەكدی جودان، ڕیشەی وشەی شیعر لە شعوورەوە هاتووە و پەیوەستە بە مەشاعیرەكانی مرۆڤەوە، بەڵام وشەی هۆنراوە لە زمانی عەرەبیدا بە مانای "منظومة"ەوە هاتووە و هەڵبەستیش بە واتای هەڵبەستنی مەبەست و بابەتێك دێت كە زیاتر لە "غیر موجود"ەكان خۆی دەبینێتەوە.

## چییەتیی شیعر

كاتێك لە "هێمن"ی شاعیر دەپرسن تۆ چییت؟
لە وەڵامدا دەڵێت:

**بۆت نووسیوم بۆت بنووسم ئەمن چیم**
**دوندی قەندیل گۆڕەپانی هەڵگورد نیم**
**بەرەو بەرزایی دەچم گەرچی وردم**
**خاكی بەرپێی تێكۆشەرێكی كوردم**

لێرەدا ڕاستەوخۆ بەیانكردنی ئەو هەست و مەشاعیرە نەتەوایەتییەی "هێمن"ە وەك شاعیرێك دێتە وەڵام.

## چییەتیی هۆنراوە و هەڵبەست

هۆنراوە ئەوەیە كەسێك وەستایانە مامەڵە لەگەڵ وشە بكات وەك گلۆرە بەنێك هێدی هێدی وشەكان بهۆنێتەوە و شتێكی لێ دروست بكات، ئەم دیاردەیە لەنێو ئەدەبیاتدا زۆرترە، چونكە ئاسانترە لە دەربڕینی ناخودئاگایی.

ڕوونتر بڵێم: گەلێک جار نووسەری ئەم دەقانە داوایان لێ دەکرێت لەسەر بابەتێکی دیاریکراو نووسینێک بنووسن و بیخەنە چوارچێوەی دەقێکی ئەدەبی، بەمە دەگوترێت "بەڕادان"دانی هۆنراوە، وەک چۆن داوا لە بەرگدروویەک بکرێت بەم تایبەتمەندییانەوە جلێک بدروێت (هەڵبەتە ئەمە زیاتر لەلای ئەو هۆنەرانە دەست دەکەوێت کە بۆ گۆرانیبێژەکان دەنووسن و هۆنراوەی لیریکی بەرهەم دەهێنن. بە واتایەکی تر: نەک بە خواستی ئەوەی چی لە هەست و شعوریاندا هەیە ئەوە بنووسن، بەڵکوو ئەوە دەنووسن کە داوایان لێ کراوە).
کە وا بوو ئەمە لە چوارچێوەی هۆنراوەدایە نەک شیعر.

یان هەندێک جار (مەرج نییە هەموو دەقێک بگرێتەوە) کەسی هۆنەر خۆی لە پەناگەیەکی ناو ناخی خۆیدا؛ خۆی دەشارێتەوە، بەم حاڵەوە چاوەڕوانیی ڕووداوەکان دەکات، ئیدی لە ساتەوەختی دەرکەوتنی ڕووداوەکان کانیاوی وشەی ئەویش هەڵدەقوڵێت، هەروەک ئەوەی لە یاد و بۆنە ئایینی و نەتەوەیی و نیشتیمانییەکان و... هتد دەنووسرێت. ببینە بە سەدەها هۆنراوە و هەڵبەستمان هەیە لەسەر یادەکانی ئادار و نەورۆز و کیمیابارانی هەڵەبجە و... هتد.

وەک ئەم نموونەیە:

**کورد میللەتێکی بەشبەشکراوە**
**لەوەتەی هەیە مافی خوراوە**
**لەوێ بۆ ئێرە لێرە بۆ ئەوێ**
**گوند سووتاوە کوڕی کوژراوە**

"زەینەب خانی مەلا ڕەئووف"

# بەشی سێیەم
# ئەو "مانی"یەی ناو شیعری کلاسیکی کوردی، کێیە؟

مانی (٢١٦-٢٧٦ز.) بە پێغەمبەری ئێرانیی سەدەی سێهەم و بناغەدانەری ئاییینی مانی دادەنرێت.

ناوی تەواوی "مانی کوڕی فاتک"ە، دایکی ناوی مەریەم بووە. لە ساڵی (٢١٦)ی زایینی لە بنەماڵەی ئەشکانیی فارسی لەدایک بووە و سەرەتای ژیانی لە هەمەدان بووە و دواتر کۆچیان کردووە بەرەو بابل. مانای ناوەکەی بە واتای دەگمەن و دانسقە دێت.

ئەو لە کتێبەکەی خۆیدا بۆ نواندنی مەبەستەکانی، لە وێنەکێشان کەڵکی وەردەگرت و لە ماوەیەکی کەمدا پەیڕەوانی زۆری لەدەوری خۆی کۆ کردەوە و وێنەکێشێکی بێوێنەی سەردەمی خۆی بووە. سەرەتا لە ڕێگەی وێنەکێشانەوە ناسرا و هەر لەناو وێنەکانیدا پەیامە ئاییینییەکەشی نمایش دەکرد.

بەڵام دواتر پێش ئەوەی کاری خۆی بەتەواوی ئەنجام بدات، لەلایەن بەهرامی دووەم پادشای ساسانییەوە لە ساڵی ٢٧٦ کوژرا. ئاییینی مانی تێکەڵکێشێک بووە لە ئاییینی مەسیحی و زەردەشتی و بوودایی. مانی پێگەیەکی تایبەت و فراوانی هەیە لە ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردی. بە هۆی ئەو دەستڕەنگینییەی هەیبووە لە وێنەکێشاندا، شاعیرانی کورد پێی سەرسام بوون و وەک ڕەمزێک بۆ جوانناسی لە شیعرەکانیاندا بەکاریان هێناوە، واتە شاعیرانی

کورد بەدوای جوانبینین و بەهرە هونەرییەکەی "مانی"یەوە بوون نەک ڕێبازە ئایینییەکەی.

بۆ نموونە:

"نالی" ڕوو دەکاتە یار، پێی ڕادەگەیەنێت کە تەنانەت "مانی" بەو هەموو بەهرە هونەرییەوە هێزی ئەوەی نییە وێنەی بڕۆی تۆ بکێشێت، چونکە ئەو قەوس و نەقشە کاری مرۆڤ نییە تا بە دەستی مرۆڤ وێنەی لەسەر بکێشرێتەوە.

**مانی نیەتی قووەتی تەسویری بڕۆی تۆ**
**ئەم قەوسە بە دەستی موتەنەففیس نەکشاوە**

"نالی"

"نالی" لەم بەیتە شیعرەدا کە گوایە بۆ "مەستوورەی ئەردەڵانی" نووسراوە، سینگ و بەرۆکی ئافرەت بە زێڕی لە قوتووی هەڵگیراو وەسف دەکات کە وێنەکە لەبەر چاوان هێندە ساف و جوانە بە سەد زەحمەتکێشانی هونەرمەندێکی گەورەی وەک "مانی"، ئینجا توانراوە قڵیشانێکی تێ کرابێت.

**حوققێکی زەڕی سافی لەسەر بانی نرابێ**
**نەختێکی بە سەد سەنعەتی مانی قڵەشابێ**

"نالی"

حوققە: بەو قوتووە بچووکەی ئافرەتان دەگوترێت کە وردەواڵەی بەنرخی خۆیانی تیایدا دەپارێزن.

"نالی" جوانی و ڕێکیی شیعرەکانی خۆی دەخاتە پاڵ کارە دەستڕەنگینییەکانی هونەرمەندی نیگارکێش "مانی" و چوواندنێک دەخاتە ڕوو لەنێوان هونەری شیعر نووسین و هونەری وێنەکێشان.

**نووكی خامەی من كە بێتە مەعنا ئارایی كەماڵ**
**خەت بە خەت ئیزهاری نەقشی سوورەتی "مانی" دەكا**

"نالی"

ئەم جارەیان "سالم"یش دەچێتە پاڵ "مانی" و پەیڕەوی کارە هونەرییەکەی ئەو دەکات، بەڵام لە تابلۆی شیعریدا وەسفی برۆی یار دەکات.

**پەنجە بۆ تەصویری ئەبرووت، پەیڕەویی مانی دەكا**
**خامە بۆ زەنجیری گێسووت، عەنبەر ئەفشانی دەكا**

"سالم"

"سالم" لەم دەربڕینەیەدا دەستەوەستانیی خۆی لەبەرامبەر جوانیی یار ڕادەگەیەنێت و تەنانەت پێی وایە "مانی"یش نەفامە کە ناتوانێت وێنەی جوانیی یارەکەی بکێشێت، ئەم جوانییە تەنها لە خامەی دەستی خودای موتەعال دەوەشێتەوە.

**بۆ خەیاڵی نەقشی تۆ مانی لە من كەودەنترە**
**ڕەنگی خامەی كردگارە صنعەتی تەصویری**

"سالم"

"سالم" هێندە جوان وەسفی ئەبرۆی یار دەکات و دەڵێت "مانی"ی نیگارکێش نیگاری برۆی تۆی کێشابێت، دەبێت شکڵی کەوان یان هیلالی وەربگرێت.

**بە جوز مانی موصەویر قەوسی ئەبرۆی تۆی نەکێشاوە**
**کەمانی نەقشی کێشابێ دەبێ هەر وا کەمانی بێ**

"سالم"

"کوردی" دەکەوێتە هەڵبژاردنی نێوان دوو ڕیاندا، مەستانە عاشق دەبێت و یا ئەوەتا وەک "مانی" بەدوای نیگارکێشانی یارەوە دەبێت، یانیش وەک فەرهادی کۆکەن دەبێت کاری سەنگکاری بکات.

**مەستیی عەشقە مانی یە یا کۆهکەن کوردی بڵێ**
**دڵ بنەخشێنە نەکوو سەنگکاریی فەرهادی مەکە**

"کوردی"

لێرەدا "کوردی" دەیەوێت بڵێت دوای ئەوەی "مانی" نیگاری چاوەکانی تۆی کێشا و ویستی تابلۆکە تەواو بکات و دەستی کرد بە کێشانی برۆی تۆ، ئیتر مەست بوو، دەستی توانای ڕاست و ڕێکیی وێنەکێشانی نەما و بەلادا لار بوویەوە.

**کە مانی هاتە سەر کێشانی ئەبرۆی تۆ لەپاش چاوت**
**لە مەستیی دەستی وا لەغزی کە کەچ هات خەتتی پەرگاری**

"کوردی"

لەم دێڕەشدا "کوردی" دەڵێت لە وێنەکێشانی کەوانەیی ئەبرۆت خاو و لەسەرخۆیە "مانی".

**لە ڕەسمی قەوسی ئەبرۆت سستە وا پەڕگارەکەی مانی**
**لە نوسخەی جەوهەری فەردی دەمت حەیرانە سەککاکی**

"کوردی"

ئەو خاڵ و لێو قەیتانی و زوڵفەی کە هەتە، "وەفایی" دەهێنێتە قسە کە پێی وایە لەبەر ئاڵۆزیی جوانییەکەت "مانی" حەقی خۆیەتی پەرێشان و حەیران بێت.

**بەو خاڵ و خەت و سووڕەتی گیسووی هەتە حەقیە**
**مـــانی کە پەرێشـــانی ســـەنەمخانەیی چیـــنە**

"وەفایی"

"مەولەوی" دەڵێت:

**مـەوینای ڕەزەن مـادەنی "کـان"ی**
**مانی وەسەنعەت سەلیقەی "مانی"**

"مەولەوی"

واتە:

ئەتبەست خەریتە و مەعدەنی "کان"ی یان کانزا، کانگا وەکوو نیگاری سەلیقەی "مانی".

لێرەدا "سافی هیرانی" دەڵێت "مانی" لە دیمەنی جوانیی تۆ هەمیشە سەرسام و حەیرانە، ئەوەندە ڕووت نیشانی هەموو

کەسێک مەدە، چونکە دڵەکان بێئارام دەبن و گیان و جەستە بێهێز و شەکەت دەکات و سەریش عەقڵی لەدەست دەدات.

**لە نەقشـــی عـــازرت حەیـــرانە دائـــیم مـــانی چینـــی**
**لەسەر ڕووی پەردە بەس لا دە هەموو شەخسێ کە نەتبینێ**
**لە دڵ ســەبر و لە تەن تــاقەت لە ســەریا عەقــڵ نــامێنێ**

"سافی هیرانی"

لـەم چـەرخ و سـەردەمەدا مـرۆڤ شـیرین جـەمالی وەک تـۆی نـەدیـوە، بۆیـە هونەرمـەدە وێنەکێشـەکان و تەنانـەت "مـانی"یـش سەریان سوڕماوە لە وێنەی تۆ.

**کەسێ لەم عەسرە نەیدیوە بەشەر وەک تۆ بەشیرینی**
**تەحەیورمـا لە تەسـویرت ئەگەر نەقـاش ئەگەر مـانی**

"سافی هیرانی"

لەلای "زەبیحی" هیچ گومانی تێدا نییە کە "مانی" لـە وێنەکێشـانی جوانییەکـەی ئـەو دڵگـران بـووە بـەوەی کـە ناتوانێـت حـەقی جوانییەکـەی بـدات، بۆیـە هـەزار لـەعلی بەدەخشـان کـە بـەردی بەبەهایە، دەکاتە فیدای لێوە جوانەکانی یار.

**لە تەسویری جەماڵی تۆ بەبێ شک عاجزە مانی**
**فیدای لێوی ئاڵت بێ هەزار لەعلی بەدەخشانی**

"زەبیحی"

ئـەم جـارەیـان "نـاری" وەسـفی دەسـتڕەنگینیی "مـانی" دەکـات و پێمـان دەڵێت کاتێـک نیگارەکـانی "مـانی" دەردەکـەوێت، وێنەکێشـی

چینی ڕیسوا دەبێت (دیارە لەو سەردەمەدا وێنەکێشی بەناوبانگی تریش هەبوون کە هاوزەمانی ئەو بوون).

هەروەها جوانییە بەناوبانگەکەی پێغەمبەر یوسف(سەلامی خوای لەسەر بێت) باس دەکات، کاتێک باسی جوانییەکەی دەکرێت، ئیدی مانایەک نامێنێتەوە بۆ جوانی و ڕازاوەیی شیرین.

من پێم وایە ئەم دێڕە کۆکردنەوە و بەراوردکارییەکی زۆر وردی تێدایە لەنێوان نیگاری دەستی "مانی" و جیلوەی جەمالی پێغەمبەر یوسف(سەلامی خوای لەسەر بێت) و ڕازاوەیی شیرینەکەی فەرهاد.

**نەقشی مانی دەرکەوێ نەققاشی چین ڕیسوا دەبێ**
**حوسنی یوسف جیلوەکە بێ زینەتی شیرین چییە؟**

"ناری"

ئەوەتا "حاجی قادری کۆیی"ش بە زمانێکی ڕەخنەیی دێتە گۆ و دەڵێت با نیگاربەندییەکەشت لەلایەن "مانی"یەوە بۆت کێشرابێت، یانی ئەوەندە جوان بێت، بەڵام چ سوودێکت بۆ من هەیە کە تۆ سوودت بۆ دین و دەوڵەت نەبێت، با لەسەر پەیڕەوانی ئەهلی نەقشبەندییش بییت!

یانی لەم دێڕەدا وشەی نەقشبەند (ڕەگەزدۆز - جیناس)ە، بە دوو واتا دەخوێنرێتەوە.

**کە نەفعێکت نەبێ بۆ دین و دەوڵەت**
**بە من چی نەقشبەندی یا نە "مانی"**

"حاجی قادری کۆیی"

جارێكی تر "حاجی قادری كۆیی" دەڵێت وەستایی و كارامەیی "مانی" كاتێك دەردەكەوێت كە بتوانێت بە قەڵەمەكەی، وێنەی زوڵفی پەخش و پەرشبووی تۆی پێ بكێشێت.

**لە سایەی زوڵفی ئەفشانی پەرێشان دێ خەتی مانی**
**لە تەسویری ئەگەر جارێ بە وەستایی قەڵەم دادا**

"حاجی قادری كۆیی"

ئەوەی دەمی یاری دروست كردووە، هێندە بەبچووكی دروستی كردووە وەكوو تەنها خاڵێك وایە، هەر بۆ نیشانە ئەو خاڵەشی داناوە، چونكە نەققاشەكە زانیی ئەو یارە بە كاری "مانی" ڕەزامەند نابێت و دەكەوێتە زەمكردنی كارەكانی "مانی" و ئیشی ئەوی پێ جوان نییە.

**نەققاشی دەمی نوقتەكی دانا بە نیشانی**
**زانیی كە زەمی كردووە، بێزارە لە مانی**

"حاجی قادری كۆیی"

ئەی پاشای باشەكان، "مانی" و "سەحبان" لە وێنای بەرزی برۆی تۆ وێڵ و سەرسوڕماون.
سەحبان: سەحبانی كوڕی وائیل لە سەردەمی جاهیلیدا ژیاوە، زمانپاراو و قسەبێژ و ئەدیبێكی بێوێنە بووە.

**بۆ تۆیە موسەللەم لە جیهان شاهی خووبان**
**داماوە لە تەصویری برۆت مانی یوسەحبان**

"زێوەر"

بیركردنەوە و خەیاڵاتی "زێوەر" لە جوانیی "ئەو"دا پەرشوبڵاو دەبێت، ئەوەتا گومانی تێدا نییە ئەگەر "مانی" دەست بكات بە وێنەكێشانی ئەو جوانە، ئەوا پێنووسی وێنەكێشانەكەی لەناو دەچێت.

**فكـری زێـوەر پـڕ فشـانە لێـرەوە تـا لامەكـان**
**مەحو ئەكا خامەی دەسی ئەو نەقشی مانی بێگومان**

"زێوەر"

"شێخ ڕەزای تاڵەبانی"یش لەم دەربڕینەدا دەستەوەستاو دەبێت لەبەرامبەر وێناكردنی جوانیی ئەو، لەبەر ئەوە پەنا دەباتە بەر شانە كاتێک زوڵف دادێنێت و بۆنی خۆشی عەنبەر لە كەزی و زوڵفیدا پەخش و بڵاو دەبێتەوە، بەمەش وێنەیەكی وەک وێنە بەهرەدارەكانی دەستی "مانی" نیشان دەدرێت.

**نیمە بۆ تەسویری ئەبرۆت پەیڕەوی مانی دەكا**
**شانە بۆ زنجیری زوڵفت عەنبەر ئەفشانی دەكا**

"شێخ ڕەزای تاڵەبانی"

"ئەحمەدی خانی" لە داستانی "مەم و زیندا" بەلای باسی ئەو "مانی"یەدا دەڕوات، دەڵێت:

**فەححاشی تە كر ژ ڕەنگێ خانی**
**نەققاشی تە كر مسالێ مانی**

"ئەحمەدی خانی"

لەم پێنجخشتەکییەدا "ئەدیب" دەڵێت عاشقان یەک بە یەک سووتاوی جوانیی تۆن و شەیدا و پەرێشان و بریندارن. لەو جوانییەتدا "مانی" بەو هەموو وەستایی و کارامەییەی کە هەیەتی، شاگردە و ناتوانێت حەق بداتە جوانییە سیحراوییەکەی تۆ.

**عوششاق هەموو شیفتەیی حوسنی تووە یەک یەک**
**شەیدا و پەرێشان و بریندارە بە ناوەک**
**شاگردە لە بۆ ساحیریی تۆ مانی و مەزدەک**
**نەشئەی دڵی من بۆ نمی لوتفی تووە هەروەک**
**پشکووتنی گوڵخونچە لە دەم بای سەبادا**

"ئەدیب"

لێرەدا "فانی" دەڵێت ئەگەر تۆ سینە و دڵ و دەروون پاک و چاکەخواز بیت، ئیدی بە ڕووکەشیش جوان دەبیت و پێویستیت بە جوانکارییەکەی دەستی "مانی" نییە تا وێنەی جوانیت بکێشێت.

**چ باکت زینەتی ظاهر ئەگەر تۆ پاکی دڵ چاکی**
**بە مانی ئیحتیاجێکی نییە دیواری باغانم**

"فانی"

لە وەسف و سەنای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)، "فانی" دەڵێت تۆ ئەوەی شاهی شاهانی جیهانی، خەجاڵەتییە بۆ من ئەگەر لەو مەقامەوە وەسفت نەکەم. ئیدی بەم شێوەیە وەسفی لێوی نازدار دەکات کە "مانی" کێشاویەتی یان بەردی بەهادارە و بووە بە ڕەمزی جوانی.

**ڕووم زەردە ئەگەر بێت و بڵێم شاهی جیهانی**

**شـایانی جیهـان شـاهن تـۆ شـاهی ئەوانـی**

**ڕەمـزی دەمە یـا جەوهەرە یـا نـوقتەیی مـانی**

**لێـوت کە عەقـیقە بـووەتە ڕوکنـی یەمـانی**

"فانی"

ئەم جوانییە سروشتییە ئیلاهییەی تۆ هەتە؛ بە وێنەی مانگە، نە کاری "بێخود"ە وەک شاعیرێک کە توانای وەسفکردنی جوانیی هەیە، نە کاری "مانی"یە کە بەهرەمەندە لە وێنەکێشاندا، ئیدی ئەمە تەنها و تەنها نەقشی دەستی پەروەردگاری جوانییە کە بەو جوانییەوە خەلقی کردووی.

**زاهیـد نە، منـی عاشـق ئەسـیرم بە نیگـاهی**

**مورشـید وەرەگێـڕێ لە ئیمـان چـاوی سـیاهی**

**کاری من و "مانی" نییە قەت سوورەتی ماهی**

**نەخشینە بە نـووکی قەڵەمـی سونعی ئیلاهـی**

"بێخود"

"مینە جاف" لە وەسفکردنی برۆی یاردا دەڵێت برۆی خوار و چەماوەیی وەکوو مانگی یەک شەوەیە و چاویشی دەڵێی بە پڕگاڵ (پەڕگار)ی "مانی" کێشراوە.

**وە تەوقی هیلال ئەبرۆی خەمیدە**

**چەمـان وە پەرگـار مـانی کەشـیدە**

"مینە جاف"

"ویسالّی" داوای مانەوەی جوانی لە یار دەکات و تکای لیَ دەکات با هەر بەو جوانییەوە بمێنێتەوە. دەڵێت لیَ بگەڕێ با ئەو جوانییەت لەناو نەچێت، چونکە جوانیی تۆ هێزی دەست و قەڵەمی "مانی"یە. دەشڵێت لەم وڵاتەی خۆمان کەس لە ڕەگەزی ئەو نییە و کەس لەو ناچێت، بەڵام مەگەر لە شام یان لە بەیرووت هاوشێوەی هەبێت.

**مەیــێڵە بــا نەفەوتــێ هەر بمێنێــت**
**کە مانی قووەتە بۆ دەست و بازووت**
**بەزەحمەت لەم ولاّتە جنسی ئەو بێت**
**مەگەر جووتێ لە شام بێ یا لە بێرووت**

"ویسالّی"

ئەگەر ماچێکی کوڵمی تۆ بکەم، ئەوە خەڵاتی "بەرات"ە بۆ من، لەوە زیاتر هیچی دیکەم داوا نییە. ڕووخسارت وەک مانگە، ڕووناکییەکەی بۆ گشت لا پەخش بووە و گەیشتووەتە لای "مانی"، بەڵام هەر ئەو جوانییەی ڕووخسار و برۆی تۆیە، "مانی" سەری سوڕماوە نازانیَ چۆن وێنەت بکێشیَ.

**گەر بکەم ماچی گۆنات لەباتیی مووچە و بەرات**
**تەمەننـای چیی تـر نـاکەم ئیتـر تـا دنیـا مـاوە**
**ڕووخسارت وەک مانگە، شوعلەی بۆ گشت دنیایە**
**لە کێشـانی بـرۆی تــۆ مـانی تەحیــوور مــاوە**

"شێخ محەمەدی حیلمی"

"عارف عورفی" وەها وێنا دەکات کە ئەو کچانەی ئادگار و گۆنایان وەک خونچەگوڵ وایە و قەد و باڵاشیان وەک نەمامن، ئیدی نەک بەتەنها "مانی"، بەڵکوو هەزارانی وەکوو "مانی" لە کێشانی ئەو وێنە جوانانەدا دەستوودامان و سەرمەست و سەرسام دادەمێنن.

**لە نەقشی غونچەیی گۆنای کچانی قەدنەمامانی**
**هەزارانی وەکوو مانی ئەکەونە دەست و دامانی**

"عارف عورفی"

"حەمدی" باسی حاڵی خراپی خۆی دەکات بەدەست جوانیی یارەوە و دەڵێت بۆ لە خەفەتتدا دڵم پارچە پارچە نەبێت، هەموو تەمەنم بەفیڕۆ نەڕوات! ئاخر گوناهـ نییە من شێتوشەیدای ئەو زوڵفە بم و لێی دوور بم، کەچی شانە کەیفخۆش بێت و زوڵفەکە دابێنێ! هەر "مانی" دەزانێ وێنەی ڕووی یاری من بکێشێت، بەوەی بازنەی خۆر لەناو زوڵفی تاریکی شەودا بەدیار دەخات.

**بۆ دڵم لەت لەت نەبێت و بۆ نەچێ عومرم بەباد**
**من پەرێشانی زلف بم شانەیی شمشاد شاد**
**مانی تەسویری نیگاری من دەزانی کە دەکا**
**قورسی ڕۆژی دەس کەوێ ئەمما لە زلفی شەو میداد**

"حەمدی"

"سەیید تاهیری هاشمی" دەچێتەوە دنیای سروشت و تێکەڵییەک دروست دەکات، پێی وایە وەک چۆن کارە جوانەکانی "مانی"؛

مرۆڤ حەیران و سەرسام دەکەن، ئەم سروشتەش هەمان نەقشە و لە جوانیدا ئاوەز و ژیری دەبات:

**گوێی هەر شەتاوێ لەبەر خەیمەی گوڵ**
**وەک نەخشی مانی هۆش دەبا لەسەر**

"سەیید تاهیر هاشمی"

"مانی" لەوە دڵگرانە کە ناتوانێت وێنەی جوانی ئەبرۆت بکێشی، هەروەک ئەو ناز و غەمزە جوانەی لە چاوتەوە هەیە، بووە بە هۆی نارەحەتیی گیان.

**ئەبرۆی تۆ تەسویرە کە لێی عاجزە مانی**
**ئەو غەمزەیی چاوت بووەتە ئافەتی جانی**

"عاصم"

وێنەی تۆ کە لە جوانیدا نموونەی نییە، بە کەس وێنە ناکرێت و بە نووسینیش وەسف ناکرێت، مەگەر دووبارە "مانی" سەر هەڵبداتەوە و دەست بکات بە وێنەکێشانی جوانییەکەی تۆ.

**صورەتی بێ میسلی تۆ کوا دێتە تەصویر و قەلەم**
**گەر دووبارە ئازەر و مانی لە چین بێنە زهوور**

"ئەدەب"

"موخلیس" دەڵێت بەو برۆیەی تۆ هەتە، هێندە جوان کێشراوە، ئەگەر لە چاوی منەوە "مانی" و ئەوانەی نیگارکێشن بتبینن، هاوکات لە هەمان شوێن کڕنووش دەبەن، چونکە تەنها نیگارکێشەکان لە سیحری جوانیی برۆت تێدەگەن.

**ئەگەر نەقشی برۆی تۆیان وەکوو من بێتە بەر چاوی**
**دەکەونە سوجدە لەو جێیە هەزارانی وەکوو مانی**

"موخالیس"

"عاصی" سەرسام بووە لە قەڵەمی نیگاری ئیلاهی کە بەو جوانییە چۆن دوو برۆی یاری کێشاوە، بەم جوانییە هەزارانی وەکوو "مانی"ی شێت کردووە.

**عەجەب لەو سوورەتە یاران قەڵەم تەسویڕی کێشاوە**
**لە نەقشی دوو برۆی شێتن هەزارانی وەکوو مانی**

"عاصی"

# بەشی چوارەم
# "ئایین" لە چەمكەوە تا واقیع لە شیعری كوردیدا

یەكێك لە تەرزە هەرە گرنگەكانی شیعری كوردی بریتییە لە شیعری ئایینی و عیرفانی و تەسەوف و پیاهەڵگوتن و ستایشی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت و كەسایەتییە ئایینییەكان).

زۆربەی شاعیرانی كورد بەتایبەت شاعیرانی سەردەمی كۆن بەم ڕێڕەوانەی شیعرییەوە شۆڕ بوونەتەوە قووڵایی مەعنەویەت و عیرفان، تا دواجار عرووجیان بەرەو ئاسمان كردووە... بەمەش ڕەنگدانەوەی دەقە قورئانی و فەرموودەكانی پێغەمبەر محەمەد (دروودی خوای لەسەر بێت) بەڕوونی لەسەر شیعرەكانیان بەدیار كەوتوون.

بە بڕوای من، پێشەنگی ئەم شاعیرانەش؛ "مەولەوی" و "مەحوی"ن. بەدوای ئەوانیشەوە لە شیعرەكانی "پیرەمێرد" پانتاییەكی فراوان هەیە بۆ شیعری عیرفانی، بەڵام بە فۆڕمێكی بانگخوازانە.

لەم بەشەدا دەمەوێ باس لە پێگەی دەقە قورئانی و فەرموودەكان بكەم لەسەر شیعری كلاسیكی كوردی و ڕەنگدانەوەی ئەو جیهانە مەعنەوییە لە ئەدەبیاتی كوردیدا، بەتایبەت ژانری شیعر.

"مەحوی" دەڵێت:

**باوەڕ ببێ خودا كە لەسەر عەرشی موستەوی**

**ئەمما بە ئیستیوایەكی بێچوون و كەس نەزان**

موستەوی: جێگرتوو

ئیستیوا: جێگرتن

لێرەدا "مەحوی" لەژێر ڕۆشنایی ئەو ئایەتەوە باس لە بوون و مەکانەتی خودای موتەعال دەکات، کە لە قورئاندا خودا باس لە عەرشی زاتی خۆی دەکات و دەفەرموویێت: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ۝٥﴾ طه: ٥

لە شوێنێکی تردا "مەحوی" هەر لە باسی زاتی خودا بەم شێوەیە دەدوێت:

**غەیری نییە، بە عەینی موسەمما بزانە ئیسم**

**"با سبح اسم" قەومی موعانید بکەن ڕەوان**

**زاتی خودا نە جەوهەر و جیسمە، نە کولل و بەعز**

**بێچوون و بێچگۆنە، مونەززەه لە ئەین و ئان**

بەم شێوەیە "مەحوی" پێمان دەڵێت لە دەستپێکەکاندا سەرکێشی و عینادی مەکەن و بە ناوی خودا یادی ئەو بکەن.

یانی ئەوە زاتی خودایە دەبێت تەسبیحاتی بۆ بکرێت، نەک تەنها تەسبیحات بۆ ناوەکەی بکرێت، وەک ئاماژەیەک بۆ گرنگیی باوەڕهێنان بە زاتی خودا تەنها گوفتار نییە، بەڵکوو کردارە، وەک لە ئایەتەکەدا هاتووە: ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى ۝١﴾ الأعلى: ١.

لە باسی پێغەبەریشدا (دروودی خوای لەسەر بێت)، "مەحوی" بە پشتبەستن بەم ئایەتە: ﴿وَإِذۡ قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُم مُّصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَمُبَشِّرَۢا بِرَسُولٖ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِي ٱسۡمُهُۥٓ أَحۡمَدُ﴾ الصف: ٦، دەڵێت:

**یەعنی پەیامبەری عەرەبی هاشمی نەسەب**
**لە ئاسمان ئەحمەد و محەمەد لەسەر زەمین**

"مەحوی" لە شوێنێکی تردا دەڵێت:

**ببیـــەن بـــە "انمـــا " و "الخـــلاص بانیـــات"**
**هەم نەسسی "مخلصین له الدین" یا ئەخوون**

واتە: براینە بۆ ئیسپاتی قسەکەمان ئایەتی:﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾ البينة: ٥، و فەرموودەی "إِنَّمَا الأعْمَالُ بِالنيات" ببیستن، کە یەکەمیان واتە فەرمانی ئەوەیان درابوویە کە بە دڵێکی پاک و خاوێنەوە خودا بپەرستن و دووهەمیان واتە پاداشتی کردەوە بەگوێرەی نیازی دڵی خاوەنەکەیەتی.

"مەولەوی" لە شیعرێکدا دەڵێت:

**من ڕۆی مامەڵەی گردین خاس و کەس**
**جەوڕاســە بــازارِ شــارەکەی "الــس"**
**جە سەر دووکانچەی شای سەر توجاران**
**هـــورگرتم کـــاڵای بـــەڵای نـــازاران**

دێت بە مامەڵەیەکی عیرفانییانەوە باسی مامەڵە و سەوداکردن دەکات لەگەڵ زاتی تەعالا، کەوتۆتە ژێر کاریگەریی ئەم ئایەتە: ﴿ أَلَسۡتُ بِرَبِّكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰۛ ﴾ الأعراف: ١٧٢ .

لە شوێنێکی تردا "مەولەوی" چاوساغیمان دەکات و شەمع و چرای نووری ئیلاهی لە دڵی ئیمانداران و ئەهلی دڵ دادەگیرسێنێت

و پێمان دەڵێت هەڵسە بە دڵی سەماوە بەرەو سەما عرووج بکە، لەو خەڵوەتە عیرفانییە کەڵک وەربگرە و ڕوو بکەرە دۆستت، ڕاز و نیازی دڵی پەنهانت بۆ ئەو زاتە بەیان بکە.

**شەوەن خەڵوەتەن ماڵ بێ ئەغیارەن**
**عالەم گرد وتەن دۆس خەوەردارەن**

هەروەها "خاکی" لە باسی ڕۆحی ئینسانەکاندا پێمان دەڵێت لە خاتەمی پێغەمبەران بپرسن نەک لە مرۆڤی ئاسایی، چونکە وەڵامە دروستەکان هەر لای پێغەمبەر محەمەدە(درووودی خوای لەسەر بێت)، جگە لەو، هەر چی بەنی ئادەم هەیە لەم باسی ڕۆحەدا وەک منداڵی بەرمەکانە و هیچ وەڵامی پێ نییە.

**"وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي" لە خاتەم بپرسە نەک ئادەم**
**موعەللیم خاتەمە و ئادەم لەلای تیفڵی دەبوستانە**

وەک لە دیوانەکەی "نالی"دا باس لەو حاڵەتە عیرفانی و تێکەڵاوییە کراوە لەگەڵ ئایین، وەک فیقهـ و ئوسووڵی دین و مەنتیق و فەلەکیاتیان تیایە، کاریگەریی دەقی ئایینی بەسەر شیعرەکانیدا زۆر بەرچاوە.

بۆ نموونە "نالی" لەو موناجاتەدا دەڵێت: خودایا! لەو بارانی بەزەییهگشتییەت کە ئەگەر بەسەر بەردی ڕەشا بباریێ؛ ئەیکا بە زێڕ، یا بەردی ڕەشی ناو دیواری کەعبەی وەک زێڕ پیرۆز و گرانبەها کردووە، دەسا خودایا ئاوڕشێنێکی ئەم دڵە ڕەش و ڕەقەی منیش بکە کە وەک بەرد وایە.

کەس دەسەڵاتی بەئەنجامگەیاندنی هیچی نییە، مەگەر ویستی تۆی لەسەر نەبێت، دەسەڵات و هێز، هەمووی هەر هیی ئەوە.

**ئەی جیلوەدەری حوسن و جلّەوکێشی تەماشا!**
**سەر ڕشتەیی دین بێ مەدەدی تۆ نییە، حاشا**
**بەو ڕەحمەتە عامەت کە دەکا سەنگی سییەهـ زەڕ**
**لەم قەلبە کە وەک بەردە، ڕەشە، "رش رشاشا"**
**لا حول ولا طول ولا قوة الا**
**بالله، لـه القـدرة، والكائن ماشا**

"نالی"

هەروەها لە شیعرێکی تردا بەخاتری پەروەردگار دەچێتە بەردەم ڕەسولی نازدار و دێتە مەیدانی نزا و حاڵی لێ دێت، دەڵێت:

**بەقوربانی عولومی ئەوەلین و ئاخیرینت بم**
**لەگەڵ ئەسراری قورئانت کە وا ئەلتافی ڕەحمانە**
**مورادم زیللەت و پاڕانەوەی حاڵە، نەوەک نەعتە**
**بە چەن بەیتێکی کوردانە کە قورئانت سەنا خوانە**
**ئەگەرچی کوردی دووری شارەزووری قەسوەتم، ئەمما**
**وەسیلەم تەیبە و  حیلمی شەفیع و فەزلی مەننانە**
**بەسەر هاتوومە ئەو خاکەی کە هەر مسقاڵە زەڕڕێکی**
**بە میزانی شەفاعەت کێوی حیلم و بەحری غوفرانە**

لە قەسیدەیەکی تردا "نالی" دەمانخاتە جەزبیەی جوانیی شەو و پێمان دەڵێ هەتا دونیا وێران نەبووە، هەڵسە و ڕوو بکەرە قاپیی ئەبەدی و فرسەتت لەبەردەم ماوە بۆ تەوبەکردن.

لێرەدا "نالی" تەواو تێکەڵاو دەبێت لەگەڵ دونیای مەعنەویەت و سەفەرێکی قووڵ دەکات بەرەو کووچە و کۆڵانەکانی ناخی خۆی و دواجار عرووج دەکات، دەڵێت:

**هەتا شەققەی فەلەک نەبووە بە کافووریی کفن هەستە**
**کە ئەمشەو فرسەتە، هێشتا فەلەک ماوی ئەتۆش ماوی**
**نەواڵـەی تۆبـە دەربێنـە، هـەتا تـەن نەبووەتـە سـفرە**
**پیاڵـەی شیشـە بشـکێنە، هـەتا وەک کووپـە نەشـکاوی**
**بـە میعراجـی سـولووکی سـالیکاندا، تـا نـەچی ڕۆژێ**
**لـەناو جـەهلی مورەککەبـدا دەمێنـی هـەروەکوو مـاوی**
**گـەدا ئینسـان و دنیـا غوربەتـە "مـن حیـث لا تشـعر"**
**بـە هیممـەت تـالیبی چ شـتێکی نـازانی بڵێـی نـاوی**
**شتێکە بێ شەبیه و جینس و فەسڵ و کەشف و تەقریرە**
**موبەڕڕایـە لــە تــەقریر و حەدیســی حــادیس و ڕاوی**

"پیرەمێرد" لە شیعرێکدا ڕەنگدانەوەی ئەم ئایەتەی لەسەرە، کاتێک باسی پێغەمبەر دەکات (درووی خوای لەسەربێت)، کە خودای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ١﴾ القمر: ١.

**مانگ بە پەنجەی تۆ دوو کەرت و شەق بوو**
**پـەرویز بـە نامـەی تـۆ جێـی پـێ لـەق بـوو**

لە شوێنێکی تردا "پیرەمێرد" باس لە وجوودی خودا دەکات کە لە نەبینراویدایە و کەچی هەموو جوولەیەک بە هێزی دەسەڵاتی زاتی موتەعال دەڕوات بەڕێوە.

دەڵێت:

**من دەیزانم تۆ لە هەموو جێ هەی**
**ئێمە دەبینی و هیچ خۆت دەرناخەی**
**بووی و هەی بەبێ زەمان و مەکان**
**"مـــا اصـــابک" دەیگێڕێتـــەوە**
**ئیــرادەی تــۆ کــەس نایگێڕێتــەوە**

هەروەها "پیرەمێرد" لە شوێنێکی تردا دەڵێت:

**مژدەی بەهاری پێیە شکۆفەی نیهالی گوڵ**
**وەکوو ئایـەتی ژیانـەوە ئومێـد ئـەدا بـە دڵ**

بـە واتایـەکی تـر ئامـاژە بـەم ئایەتـە دەکـات: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾ آل عمران: ١٦٩.

"صەیدی هەورامی" لە شیعرێکدا دەڵێت:

**جە دیوان و سەبای سا چێش بکەرمێ**
**نـەبا دامـان بـە دەسـتی چـەپ قـەباڵا**
**کـــەریما "غـــافر الـــذنب"ا ڕەئووفـــا**
**ڕەحیمـــا، بـــێ شـــەریکا، بـــێ زەواڵا**
**بـــە لـــوتفی تـــۆ قـــەوی ئومێدمانـــە**
**نـەبیمێ قـەهر و تـۆ، دڵمـان زوخـاڵا**
**ئومێدمان هەن پەنامان دەی جە دۆزەخ**
**نـەک ئێمـە حـۆر و جەننـەتمان خـەیاڵا**

واتە:

لە دیوانی قیامەتا چی بكەین ئەگەر نامەی كردەوەكانمان بە دەستی چەپ وەربگرینەوە، چونكە ئەوەی نامەی كردەوەكانی بە دەستی چەپ وەربگرێتەوە، ئاماژەیە بۆ چوونە دۆزەخەوە، لەو حاڵەشدا دەڵێن خۆزیا نامەكەمان نەدرایە دەستی چەپ و هەر نەمانزانیایە حیساب و كیتابی نامەی كردەوەكانمان چۆنە.

دیارە ئەمەش لەژێر كاریگەریی ئەم ئایەتە پیرۆزەیە: ﴿ وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِى لَمْ أُوتَ كِتَٰبِيَهْ ﴿٢٥﴾ وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ ﴿٢٦﴾ ﴾ الحاقة: ٢٥ - ٢٦ .

هەروەها لەژێر ڕۆشنایی ئەم ئایەتە: ﴿ وَإِنِّى لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ ﴿٨٢﴾ ﴾ طه: ٨٢، صەیدی" داوای لێخۆشبوون لە زاتی تەعالا دەكات و دەڵێت:

**ئیلاهی تۆبەی ئیخلاسمان قبوڵ كەی**
**قبوڵ تۆبان جە عوسیان چی بنالا**
**یـــــــەقین " وَإِنِّى لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ "**
**پەرێ بەخشاییمان شاهێد بە حالا**
**شەفاعەت خوای گوناهكاران محەمەد**
**كە ساحێب عیززەت و جاهـ و جەلالا**

واتە: یەقین و ڕاست و بێشكە، خۆت فەرمووتە: ﴿ وَإِنِّى لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ ﴾ ئەم ئایەتە بۆ لێخۆشبوونی شاهێدی حاڵمانە، یانی تۆ بەزەییت پیاماندا دێتەوە و عەفوومان دەكەی.

"زەینەب خانی مەلا ڕەئووف" لە شیعرێكدا پێمان دەڵێت ئەی بەندەی خودا بەدوای خودی خۆت بكەوە و خودا بدۆزەرە و لەو

مەغزایەدا عرووج بکە. فیکر و تێڕوانینتان با هەر بۆ دونیا نەبێت، بەڵکوو پێویستە ئاڕاستەکەی بۆ خوا چوون بێت.

هەروەها ئاماژە بە حەقناسینی زاتی خودا دەکات و هەر چییەک لەوەوە بێت، بە حەق قبوولّیەتی.

لە شیعرەکەیدا دەڵێت:

**واعیزێ دەیگوت بە بولبوول: هێندە شین و زاری مەکە**
**هێندە بەسۆز و ناڵە و شین، دادی بێقەراری مەکە**
**سۆفی با لەسەر بەرماڵا، نەگەڕێتەوە لای دونیا**
**فکری با هەر لای خوا بێ، بە نەغمەت بێداری مەکە**
**سوبح مەست و نەسیم مەست و تەبیعەت مەست**
**بەو هەموو مەستی مەستانە، دەردی مەستان کاری مەکە**
**هەور لە تافی گریانە، باران لە تافی تۆفانە**
**هەر تۆفانە ئەو تۆفانە، بە تۆفانت چاری مەکە**
**ئەگەر زەینەب بناڵێنێ وەکوو بولبوول، ناحەق نییە**
**حەق گەر هەبێ هەر لای حەقە بەناحەق بێزاری مەکە**

"زەینەب خان" لە شیعرێکی تردا دەڵێت:

**کوا وەفای بەندەییت بۆ خوا، بۆ سەری خۆت لە هەش نانێی**
**خۆ ئێسقانیشت نامێنێ لەنێو خاکی کوردەواری**
**زەینەب نەکەی بێئومێد بی دڵت نەلەرزێ و مەترسە**
**دەرگای عەفووی خۆی داناخا، بە ڕەحمەتی بێشوماری**

ئەو ئومێدە بەرز و جوانە عیرفانییەی "زەینەب خان"، لە [لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ] وەرگیراوە.

"وەفایی" لە شیعرێكدا دەڵێت:

**هیچ تەبیبێ ڕێی نییە دەردی دەروونم كا دەوا**
**ئەمڕۆ گەر چارەم نەكەی "وا حسرتا یوم الندم"**
**من چلۆن مەحرووم ببم ئەی "رحمة للعالمین"**
**دێ سەدای "لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ " دەم بە دەم**

لێرەدا "وەفایی" هاواری عیشقی لێ هەڵدەستێ و دەڵێت دەردی دەروونی منە بە هیچ تەبیبێک چارەی ناكرێت، ئەمڕۆ تۆ فریام نەكەویت، ڕۆژی قیامەت هاوار بە ماڵم. ڕوو دەكاتە ئەو كەسەی بۆ جیهانییان مایەی ڕەحمەتە و دەڵێت من مەحرووم نابم، چونكە هەردەم دەنگی ئەم ئایەتە لە گوێمدا دەنگ دەداتەوە كە خودا فەرموویەتی لە ڕەحمەتی خودا نائومێد مەبن.

"موفتی پێنجوێنی" لە شیعرێكدا دەگاتە لوتكەی هیوا بە ژیان بوون و هێزی هەڵسانەوەی دوای كەوتن باس دەكات، سەرەنجام ئەم ئومێدە دەگەڕێنێتەوە بۆ هێزی ئیلاهی و هەموو شت بە ئەو دەسپێرێت و سوپاسگوزارە لەبەرامبەر زاتی خودای موتەعال.

دەڵێت:

**وەختە كوێستانی دڵم بەفری خەمی ڕەش بێتەوە**
**وا ژیان و ژینی من دووبارە ڕێک ئەخرێتەوە**
**دڕكی میحنەت مودەتێ بوو چوو بە جەرگمدا بەڵام**
**"حمد للە" وا ئەزانم زووبەزوو دەربێتەوە**
**گەر خوا مەیلی بێ، شادی لە جێی شیوەن ئەبێ**
**شەرابی دووبارە سەد باری لەسەر ئەخورێتەوە**

"حاجی قادری كۆیی" دەڵێت:

**شیعرەكانم كە غەریبی وەتەن و نەو سەفەرن**
**وەرە بیخوونەوە ئەم نوقتە سەوابێكی هەیە**
**قەدری "حاجی" بگرن مەقسەدی هەر دیدەنییە**
**وەرنە هەر چی بگری نانەک و ئابێكی هەیە!**

مەبەست لەم "نوقتە"یە ئەوەیە ئەگەر نوقتەیەک بۆ وشەی سەفەر زیاد بكەیت، دەبێتە سەقەر، واتە جەهەنەم، ئەوەیش بۆیە بە سەواب دادەنرێت لە ئیسلامدا، یانی دەیەوێت پێمان بڵێت خۆشویستنی نیشتمان و دووركەوتنەوە لە زێدی خۆی؛ لە ئیمانەوە سەرچاوەی گرتووە، وەک پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموویت: "حب الوطن من الإيمان".

"بێكەس" بە پشتبەستن بە فەرموودەیەكی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)، ڕوو دەكاتە كەسایەتییە ئایینییەكان و داوایان لێ دەكات ڕەچاوی پێشكەوتنی زانست و هونەر بكەن و خەڵک بۆ ئەو باسە هان بدەن و بە حەرامیان مەزانن.

بێكەس دەڵێت:

**"اطلوب العلم ولو بالصين" گەر تێبگەی تەمام**
**قەتعییەن تەحسیلی فەن و مەعریفەت ناكەی حەرام**

نابێت ئەو ڕەهەندە نادیدەیە بگرین كە دیوێكی تری ڕەنگدانەوەی وجوودی خودای موتەعال و بوونی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) لەسەر شیعری كوردی، بریتییە لە لێكدانەوە و خوێندنەوەی تر بۆ شیعری شاعیران كە ڕاستەوخۆ

یان ناڕاستەوخۆ پرژاونەتە سەر بابەتە عیرفانییەكان و تێكەڵ بە شیعرەكانیان بوون، بەڵام بە كوفر و بەزاندنی هێڵی سوور ناسێنراون، لەمەشیاندا تێگەیشتن لە دەقە شیعرییەكان لە كەسێكەوە بۆ كەسێكی تر دەگۆڕێت و هەر كەس لە گۆشەنیگای خۆیەوە ناواخنی شیعرەكە دەناسێتەوە، یانی بۆ چ مەبەستێك بچێتە ئەو بازاڕە؛ كڕیاری ئەو كاڵایە دەبێت.

با دیقەت بدەینە ئەو شیعرەی "هێمن مەهابادی":

**دیم كچێكی لەباری لادێیی**
**بۆ نوێژ ڕادەخا بەرەلبێنێ**
**گوتم: ئەی نازەنین كە ڕووخسارت**
**هەموو باخی بەهەشت دێنێ**
**بۆچی پێت وایە ئەو خودا گەورە**
**هێندە بێ ڕەحمە تۆش بسووتێنێ!**

دەشێ بە هەناسەیەكی عیرفانییەوە لێكدانەوە بۆ شیعرەكە بكەین و پێمان وا بێت"هێمن" مەبەستی ئەوە بێت سەرەتا جوانی و ڕازاوەیی باخەكانی بەهەشت وێنا بكات، لەپاڵ ئەوەیاندا جوانیی یار تەعزیم بكات. پاشان لوتكەی ڕەحم و سۆز و مهرەبانییەكەی خودای گەورە وەسف دەكات.

ئەوەشمان لەیاد نەچێت، ڕەنگە خودی شاعیر مەبەستی ئەو نیشاندانە نەبێت، بەڵام حاڵەتەكە دەكەوێتەوە سەر تێڕوانینی خوێنەر و لە چوارچێوەی خۆیەوە دایدەتاشێت.

دەگێڕنــەوە جارێکیــان لــە "هــێمن" دەپرســن مەبەســتت چییــە لــەو شیعرە:

**مــاچم دەرێ مــاچی خــودایی**
**کە بێزارم لە ماچی سینەمایی**

"هــێمن"یــش ڕاشــکاوانە دەڵێــت: بــۆ ڕێکخســتنی وەزن و قافیــەی شــیعرەکە وام نووســیبوو، بــەڵام بــۆ خوێنــەرانی جــێ دێڵــم چــۆن لێکدانەوەی بۆ بکەن.
"تەڵعەت تاهیر" لە شیعرێکدا دەڵێت:

**لەو بەرزاییەوە خودا جوانیت ببینێت بۆ خۆییت دەباتەوە**

دەشــێ وای لــێ بخوێنرێتــەوە کــە خــودا لــە ئاســتێکی بــەرزەوە دەڕوانێتە جوانییەکان و پەسەندی دەکات.
"عەبدوڵڵا پەشێو" لە شیعری "بۆ خوای خەوتن" ڕاست و ڕێک بە زوبانی پاڕانەوە ڕوو دەکاتە قاپی خوداوەند و داوای کۆمەکی پشوودان و سرەوتنی لێ دەکات. جگە لە هێزی خودا، هیچ هێزێکی تر شک نابات بۆ ئارامشی و حەسانەوەی.
"پەشێو" دەڵێت:
**ئەی خودای خەوتن،**
**وا شەو هات، شەو!**
**پێشکەشم کە وچانێک خەو.**
**یا هەر نەبێ، تەنیا ساتێ،**
**مێشکم سڕ کە بیدەرێ بەنگ...**

**ئەگەر نەشخەوێ،**

**لە کار کەوێ وەک هیی دەبەنگ!**

کۆتـایی ئـەم بەشـە، بـەم شـیعرە عیرفانییـەی "هێمنـی مـام نـادر" دەهێنم:

**لـــەودیو ســـنووری تەریقەتـــەوە**
**تـــۆ دەپەرســـتم شـــەیدایی وایـــە**
**بێبـاکم لـەوەی خـوێنم حـەڵاڵ کـەن**
**کـوا عاشـقی ڕاسـتگوێیی لـە دنیایـە**
**منیش مەنسوورم ئـەم ڕێیـە دەگـرم**
**ڕێگـای بـەرەو تـۆ بـۆ مـن بڕوایـە**
**جاڕی فیدابوون ئـەمجار مـن ئەیـدەم**
**چونکـە مـەعبوودم لـە هەناومایـە**
**بانگی ئەشق ئەدەم تا دوا هەناسەم**
**چـون ئەشـق پاکـە و پیرۆزیـی تیایـە**
**فـەنا بـووم لـەناو دونیـای ئـەوینا**
**کـەچی پـێم وایـە هـەر سـەرەتایە**
**مـن لـە پەروانـە فێـری ئـەوین بـووم**
**هـەتاکوو سـووتان ڕووم لـە چرایـە**
**چۆن سوجدە بەرم بۆ ئەشقێکی تر**
**کـە بـاڵای ئەشـقی تـۆ لـە هەورایـە"**

# بەشی پێنجەم
# "لولاک" لە شیعری کلاسیکی کوردیدا چۆن مامەڵەی لەگەڵدا کراوە؟

زۆرینەی شاعیرانی کلاسیکی کورد کاتێک دێنە سەر باسی مەدح و سەنای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)، باسی "لولاک" دەکەن، بەتایبەتی لە ناوەندی تەریقەتە سۆفیگەرییەکان، گوایە ئەمە فەرموودەی قودسییە، بەڵام ئەوە هەڵەیە و نەک تەنها فەرموودە نییە، بەڵکوو هەڵبەستراوە بە دەمی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لەسەر بێت). بۆ ئەم پرسە، زانایانی فەرموودەناس ئەمە ڕەت دەکەنەوە کە فەرموودەی قودسی بێت.
ئەم چەمکە لەم وتەیەوە وەرگیراوە:
"لولاک لولاک لما خلقت الأفلاک"، کە بە فەرموودەی قودسیی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێت) ناسراوە.
هەر لە بنەڕەتدا، بوون و ژیان و ژینی مرۆڤ بە پێغەمبەر محەمەدیشەوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، هەمووی بۆ بەندایەتیکردنی خودای گەورە خەلق بووە. ئەوەتا "ئیمام محەمەد بن عەلی شەوکانی" لە کتێبی "الفوائد المجموعة في الاحادیث الموضوعة" باسی دەکات.
بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە بۆچی زۆرینەی شاعیران کەوتوونەتە ئەو هەڵەیەوە، لە کاتێکدا ئەوان پەروەردەی سوختەخانە و حوجرە و مەدارسی ئایینی بوون؟

بە بڕوای من، هۆکاری بەرفراوانبوونی ڕەوشی چاپ و چاپخانە و نەگەیشتن بە زانیارییەکانە، بەتایبەتیش لە سەردەمی دەسەلاتی دەولەتی عوسمانی.

هەروەها بە جۆرێک لە جۆرەکان چاولێکەری و لاساییکردنەوە لەلای شاعیرانەوە هەبووە و ڕەنگدانەوەی شیعرەکان بەسەر شیعری یەکتریدا هەبووە، ئەمە وای کردووە ئەم "لولاک"ەش لە دیوانێکەوە بۆ دیوانێکی تر بپەڕێتەوە.

لەنێو هەموو ئەو شاعیرانە، "مەلا ئەحمەدی قازی پێنجوێنی" تاکە شاعیرێکە دەرکی بەوە کردووە کە بۆچوونی جیاواز هەیە لەسەر چەمکی "لولاک" و ئەمیش وەک وەڵامێک بۆ ئەو کەسانەی گومانیان لە ڕاستی و دروستیی قەولەکە هەیە و ڕاستەوخۆ پێمان دەڵێت شک و گومانی نییە و ڕاستە فەرموودەی "لولاک لولاک..."، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەم "لولاک لولاک ..."ە قسەی لەسەر بووە و خەڵکانێک هەبوون بە شک و گومانەوە لەو باسە دواون، بۆیە ئەمیش بەم شیعرە دێتە وەڵام و دەڵێت:

**دیارە لەبەر ئەو خودای "لا مکان"**
**بۆی بەدی هێناین ئەرز و ئاسمان**
**شک نییە ڕاستە فەرموودەی "لولاک**
**لولاک لما خلقت افلاک"**

"مەلا ئەحمەدی قازی پێنجوێنی"

"پیرەمێرد" سەنای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەکات و پێمان دەڵێت ئەمە قسەی خودایە کە تۆ هۆکاری ئافراندنی ئەم گەردوونەی.

**تـۆی ڕەحــمەتەن للعــالمین هەر تــۆی حیمــامی ئەنبیــا**
**خوا کە فەرموویەتی لولاک، دیارە کە تۆی مایەی ئەفلاک**

"پیرەمێرد"

دیسانەوە پیرەمێرد ئاماژە بەوە دەکات تەنها هۆکاری ئافراندنی گەردوون؛ پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر بێت)، چونکە هەر ئەو شیاوی ئەوەیە گەردوونی لە پێناودا خەلق بکرێت، لە کاتێکدا ئەو زاتە سینەی شەق کراوە و پاکیی هەمیشەیی تیایدا جێگیر کراوە.

**بەر لەوەی ئادەم کە وا صەفی بوو**
**تۆ مصطفی بووی بەڵام خەفی بوو**
**مایـەی خلقـەتی ئـەفلاک "لـولاک"ە**
**بـە "الـم نشـرح" صـدری تـۆ پاکـە**

"پیرەمێرد"

لێرەدا "پیرەمێرد" کە باسی جوانیی سەروسیما و شەوڕەویی پێغەمبەر دەکات (دروودی خوای لەسەر بێت)، دواجار ئافراندنی گەردوون بە خەڵاتێکی خودایی دەزانێت کە تەنها شایان و شایستەی ئەوە.

**میحرابی برۆیشت بووەتە قوسین او ادنا**
**شـایانی بەرت خەڵعەتـی لـولاک ولعمـرک**

"پیرەمێرد"

"وەفایی" لە ڕێگەی ئەم دێڕە شیعرەوە باس لە غەزای ئوحوود دەکات کە تیایدا ددانی پیرۆزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) شەهید دەبێت، لەوێوە ناسناوی "لولاک" بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بەکار دەهێنێت.

**سەخابەی بۆچ شکا؟ بۆچی شەهید بوو گەوهەری پاکی؟**
**محەمەد، باعیسی بوون، شاهی تاج و تەختی لەولاکەم**

لای خۆیەوە "نالی" لە باس و سەنای سەروەردا وەسفی ئەو نوورە دەکات و ئافراندنی عەرشی خودا و زەوی و هەر چی مرۆڤ و گیاندار هەیە لەلایەن خودای گەورەوە، تەنها لە پێناو سەروەر بووە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە ئەمەش هەم دیسان ئاماژەیەکی ڕوونە بە چەمکی "لولاک".

**چ نوورێکە لە حوجرەی ڕەوزەدا وا قائیمە قوببەی**
**قەوامی عەرش و فەرش و قەلبی ئینس و قالەبی جانە**

"نالی"

بەلای "حاجی قادری کۆیی"ەوە هەر ئەوەندە بەسە کە تۆ خەڵاتی ئیلاهییانە کراوی بەوەی گەردوون و هەر چی لە ناویدا هەیە لە پێناوی تۆدا ئافرێنراوە، ئیتر سەنای تۆ لەوە زیاتر دەوەستێت و تۆ دەگەی بەوپەڕی جوانی و تەواوی و شکۆمەندی.

**خەڵاتی عیززەتی "لولاک" و تاجی "ارسلناک"**
**بەسە سەنایی جەلال و کەمالی خوڵقی عەزیم**

"حاجی قادری کۆیی"

"ناری" داخ و ئەسەف دەکێشێ کە لە ئەهلی یار و یاوەرانی زاتێک نەبووە کە گەردوونی لە پێناودا ئافرێنراوە.

**دوور و بێبەهـرەی مەدیـنەی خـاکی عەنبەرنـاکی خـۆم**
**ئەی ئەسەف مەحرووومی زومرەی حەزرەتی لەولاکی خۆم**

"ناری"

"حەمـدی" بـەیـانی تەوبـەی خـۆی دەکـات، سەرمەسـتی و حەیرانبوونی خۆی دەبەستێتەوە بە گەردوون و فریشتەکان کە ئەوانیش نهێنیی ئافراندنیان لەلایەن خوداوە بۆ بوونی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێت) دەگەڕێتەوە.

**هەر بە ئانێ کاشفی سیڕڕی سەماوات و مەلەک**
**وەک ئەفلاک و مەلەک حەیرانەکەی تۆم تۆبە بێ**

"حەمدی"

"حەمدی" دەڵێت:

ئەو مرۆڤە گەورانە کە سەری بەرزیان لە کەشکەڵانی فەلەک دەدات، هێندە بەویقارن، ئەوانەن کە سەریان لەسەر خاکی عیشق و ئاشنایی و ئەڤینە.

به واتایەکی تر: کۆدەکانی ئەم دێڕە شیعرە پێمان دەڵێت مرۆڤ سەربەرز دەبێت بە خۆشەویستی و ئەڤین و ئاشنایەتیی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێت)، وەک چۆن ئەو پێغەمبەرانەی نهێنیی خودایان وەردەگرت، خوازیاری دیدارێکی پێغەمبەر محەمەد بوون (درووودی خوای لەسەر بێت).

**ئەو كیبــارانە ســەر لە ئەفلاكــن**
**كە لە ڕێــی ئاشــنایی یــا خــاكن**
**ئەو ڕەسووڵانە واقیفی سڕ بوون**
**مەوریــدی واریــداتی لەولاكــن**

"حەمدی"

حـەریق لـەبریی ناوهێنـانی پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر بێت)، وشـەی "لـولاک" دەهێنێتـەوە و پێمـان دەڵێت هـەر كەسـێک زیندوویەتیی عیشقی ئەو زاتەی لە دڵدا نەبێت، وەک مردوو وایە.

**لە ئادەم تا بە خاتەم جوملە عالەم پڕ سەدا و سەیتە**
**بە عیشقی حەزرەتی لەولاک ئەوی زیندوو نەبێ مەیتە**

"حەریق"

"مەولانا خالیدی نەقشبەندی" دوعای لێخۆشبوون لە زاتـی خـودا دەكات كە لەبـەر خـاتر و ڕێـزی ئـەو پێغەمبـەرەی كە بـە "لـولاک" وەسـفی كـراوە، هـەروەها لەبـەر ڕێـزی ئـەو چاكەخوازانـەی لـە تاریكیی شـەوگاری ئـەم دونیا خـەریكی كاری چاكـەن، لێی خـۆش بێت.

**خوایە بۆ حورمەتی پێغەمبەری نەعتی لەولاک**
**هەم بە چاكانی شەبوستانی سوپەهری دووار**

"مەولانا خالیدی نەقشبەندی"

پێغـەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر بێـت) دەفـەرموویێت: "الـدنیا جیفـة و طلابهـا كـلاب"، واتـە: دونیـا لاكـە تۆپیـوە و ئەوانـەش كـە دەیانەوێ، سەگی سەر لاكە تۆپیون.

"مەحوی"یش بەم تێگەیشتنەوە پێی وایە دونیا وەک لاکە تۆپیو وایە، ئیدی بۆچی وەک سەگ شەڕی لەسەر بکەین! هەر لەو چوارچێوەی بە هیچ نەزانینی دونیاشدا، "مەحوی" دوعا دەکات خودایە بەخاتری حەزرەتی لولاک کە پێغەمبەرە (درووودی خوای لەسەر بێت)، لای بدەی و دووری خەیتەوە لە لاکە تۆپیوی دونیا.

**دەزانـــــی جـــیفەیە دنیـــا، دە حەیـــفە**
**وەکوو سەگ ئەم شەڕوشۆڕە لەسەر لاک**
**خــودا تــۆ لاگــری لــەو لاکــە "مــەحوی"**
**بــە جــاهی پادشــاهی تــەختی "لــولاک"**

"مەحوی"

"صەیدی هەورامی" بەم دەربڕینە عیرفانییەوە بە زمانی فارسی سەڵاوات دەنێرێت بۆ گیانی سەروەر کە بە "لولاک" ناوی دەهێنێت و دەڵێت: بۆ پادشای تاجداری "لولاک"؛ سوڵتانی سەر ڕووی ئەرز، هەموو کاتێ لە دڵێکی پاکەوە سەد هەزار سەڵاواتی لەسەر بێت.

**بر شاه تاج "لولاک" سلطان عرصەی خاک**
**هر لحظە از دل پاک صلوات صد هزاران**

"صەیدی هەورامی"

"عاصم" لە وەسف و سەنای سەروەردا دەڵێت، تەنها بەخاتری تۆیە خودا ئەو هەموو کەون و گەردوون و هەر چی لە ناویشیدا هەیە، ئافراندوویەتی و هێناویەتیە وجوود.

**گـەر لەبـەر خـاتری تـۆ نـەبووا، نەیـدەکرد زاتـی خـودا**
**خەلقی هیچ ئەشیا لە جن و ئینس و ئەفلاک زەمین**

"عاصم"

"تاهیر بەگی جاف" هاواری شەفاعەت بۆ زاتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەبات، کە بە هۆی گوناهەکانیەوە قوڕبەسەر و خەجاڵەت بووە، تەنها ڕێگەی نەجات و دەربازبوونی لەو بارودۆخەی تێی کەوتووە؛ "شاهی لولاک"ە.

**ڕوو لە کێ کەم غەیری تۆ ئەی شافیعی زومرەی ئەسیم**
**مـن گوناهبـار و خەجـاڵەت، تـۆ شـەفیعولموزنیبین**
**خـۆ لە قـوڕ بگـرم بەجارێ هەر لە پـێ تـا تەوقـی سـەر**
**بەڵکـوو لـوتفی شـاهی لەولاک بـێ نەجـاتم دا لە شـین**

"تاهیر بەگی جاف"

"زێوەر" مەبەستیەتی بڵێت ئەو کەسەی خودا بە حەق بناسێت و ئینجا باوەڕی بە پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێت) هەبێت، ئەوە ئەساڵەت و داواکراوە.

**کـوردێکم ئەوێ نەکـا مەرایـی**
**بۆ خاوەنی فلس و مولک و ئەملاک**
**کـوردێکم ئەوێ کە خـواش بناسـێ**
**ئیمـانی ببـێ بە شـاهی لەولاک**

"زێوەر"

ئەگەرچی "حەیدەری" وشەی "لولاک" بەکار ناهێنێت، بەڵام هەمان گوزارشتە لەوەی گەردوون و هەر چی لەناویدا هەیە، بەخاتری پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) ئافرێنراوە.

**هەر لەبەر تـۆ بـوو دروسـتی کـرد خـودای بـێ شـەریک**
**عەرش و کورسی و قەلەم، کەون و مەکان، ئینسان وجین**

"حەیدەری"

ئەوەتا "سەیید تاهیر هاشمی" گیانی خۆی دەکات بەفیدای زاتی پێغەمبەر(درووودی خوای لەسەر بێت) و بە لولاك و جیلوەی ڕەوزە ناوی دێنێت.

**گیانم بەفیدای سینەیی سەد چاکی مەدینە**

**جێی جیلوەیی ڕەوزەی شەهی "لولاک"ی مەدینە**

"سەیید تاهیر هاشمی"

هەم دیسان "سەیید تاهیر هاشمی" ڕووی شەفاعەت بۆ لاتی زاتی شافیع وەردەچەرخێنێت و بە "لولاك" باسی دەکات.

**لە دەرماڵی خودادا شافیعم بۆ مانەوەی قەسری**

**شەهی تەختی "لعمرک" سەرفەرازی تاجی "لولاک"ە**

"سەیید تاهیر هاشمی"

"سەیید تاهیر هاشمی" سوێند بە حەقی زاتی لولاك دەخوات و لە دڵ و دەروونێکی چاکەوە داوای بەزەیی دەکات بۆ حاڵی ماندوو و بەئازاری خۆی.

**بە حەققی ئەو کەسەی وا جورعەنۆشی بەزمی "لولاک"**

**دەروون چاکم دەسا ڕەحمێ بە حاڵی خەستە و زارم**

"سەیید تاهیر هاشمی"

"لوتفی"یش شەکوای هەیە لەدەست نەفسی بەدکرداری خۆی، بۆیە تاکە دەروازەی ڕێگەی ڕزگاربوون؛ کۆمەککردنی حەزرەتی پێغەمبەرە (درووودی خوای لەسەر بێت).

**لوتفی بەس شیوەن بکە بۆت ناگێڕێ نەفسی بەدت**

**شاهی لەولاک بێتە ئیمداد نووری ئیمانم وەرە**

"لوتفی"

"ئەحمەدی خانی" باسی پێغەمبەر دەکات (دروودی خوای لەسەر بێت)، بە پادشای سەر عەرشی "لولاک" و بە پێشەنگی ئەو ئاسمانە بەرزە ناوی دەبات.

**ئەی پادشەهێ سەریر "لولاک"**

**ڕابــەر هــەرە ئاســمانی چــالاک**

"ئەحمەدی خانی"

ئــەوەی تــەنها ئیمــانی هــەبێت، ئەوەنــدەی بەســەر کــە پێغەمبــەر (دروودی خوای لەسەر بێت)؛ "لولاک"ە، بۆ ئەهلی دڵ و شهوودیش ئەم دوو ئایەتە شیفابەخشن.

﴿ لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ لَفِي سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿٧٢﴾ ﴾ (الحجر). واتە:"بە گیانی تۆ، بەڕاستی ئەوانە لەناو مەستی و سەرخۆشیی خۆیاندا سەرگەردانن."

﴿ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ وَتَعْلَمَ ٱلْكَـٰذِبِينَ ﴿٤٣﴾ ﴾ (سورة التوبة: ٤٣).

واتە: "خودا عەفوت کات بۆ ئیزنت دان! تا بەباشی بۆت دەربکەوێت کامانەیان ڕاست دەکەن و کامانەشیان درۆزنن."

**فەقەط "لولاک"ە کافی و وافییە، بۆ هەر چی "مؤمن" بێ**

**"لعمـرک" هـەم "عفـا اللـە عنـک" شـافی ئـەهلی إذعانـە**

"سەیید ئەحمەدی نەقیب"

قەدرگرانی و قورسایی و شکۆمەندیی پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێت)، "فەقێ قادر هەمەوەندی" دەهێنێتە دەربڕین و بەم شێوەیە دروود و سەڵاوات بۆ گیانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەنێرێت.

**بــە وەزن زەمــین میــزان خاشــاک**
**درووود بەر محەمەد نەبی "لولاک"**

"فەقێ قادر هەمەوەندی"

"دەشــتی" وەســف و ســەنای پێغەمبــەر دەکــات (درووودی خــوای لەســەر بێــت)، ئــەو زاتــە بــە ســەنتەری دروســتبوونی گــەردوون دەناسێنێت.

**غەواسە لە عوممانەوە ئەلقابی محەمەد**
**لەولاکە ئیلا مەرکەزی ئەفلاکە محەمەد**

"دەشتی"

هەروەها "مەلای باتەیی" خاوەنداریەتیی ناسناوی گەردوون و تەخت و تاراجی "لولاک" و گەڕیدەی حەوت تەبەقەی ئاسمانەکان دەبەستێتەوە بە پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێت)، کە تەنها کەسێکە شایستەی ئەو مەقامە بێت.

**خــودانێ تــەخت و لەولاکــە**
**ســیارێ هــەفت ئەفلاکــە**

"مەلای باتەیی"

"پەرتەوی هەکاری" لە وەسفی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێت) دەڵێت:

**ئــەی تکاکــاری گوناهبــارانی ئوممــەت،**
**ئەی بەروبوومی داری نوور و ڕەحمەت،**
**ئــەم "لــولاک لمــا خلقــت افــلاک"ە**
**بــۆ تــۆ بووەتــە نیشــانە و بەڵگــە**

**ئـــەی شـــەفیعێ مـــوزنیبێ ئوممـــەتێ**
**ئـــەی بـــەری دارا ژ نـــوورا ڕەحمـــەتێ**
**ئـێ کـو "لـولاک لمـا خلقـت افـلاک"**
**بۆتـــە بـــوو نیشـــان و پهبتـــا ئـــایتێ**

"پەرتەوی هەکاری"

لێرەدا دوای مەدح و سەنای سەروەر و ناوهێنانی بە شاهی لولاک، شاعیر داوای هیممەت و ڕێگەی نەجات لە زاتێک دەکات کە تەنها مرۆڤێکە خودای گەورە شەوڕەویی پێ خەڵات کردووە و ڕێزی تایبەتی لێ گرتووە.

**ئەی شاهی "لولاک لولاک" قابە قەوسەینت مەقام**
**تـۆ و "سـبحان الـذي اسـرى" بـەقوربان هیممـەتێ**

"شێخ عوسمانی سیراجەدین"

لەم پارچە شیعرەشدا هەم مەدحی سەروەر کراوە و هەم باس لە مەقامی گەورەیی پێغەمبەر کراوە (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە لە شەوی ئیسڕا و میعراجدا بۆ ئاسمانەکان بەرز کرایەوە. کاتێک باسی نۆ تەبەقەی ئاسمان دەکرێت، دیارە تێگەیشتنێکی ئەو سەردەم بۆ زانستی فەلەکیات وەها بووە، پێیان وا بووە ئاسمانەکان لە نۆ تەبەقە پێک هاتوون.

**شای تاج "لولاک" شای تاج "لولاک"**
**حبیـب نـازدار، شـای تـاج "لـولاک"**
**پایـەی میعراجـت نـۆ تەبـەق ئـەفلاک**
**طبق عن طبق یەک یەک جە هەم تاک**

"سەیید صادق"

"بێبەش" دەڵێت کاتێک تۆ گەورە و فاخیری عەرەب و عەجەمی، ڕۆح و گیانم بەفیدات دەکەم. لەوە زیاتریش ناتوانێت وەسفی پێغەمبەر بکات (دروودی خوای لەسەر بێت) کە خودای پەروەردگار ناسناوی "لولاک"ی پێ بەخشیوە و بەو مەقامە وەسفی کردووە.

**ئەی شەهی شاهان و گەورە و ئەفخەری عورب و عەجەم**
**وەی فیدات بێ ڕۆح و جیسم ناکرێ وەسفت بە دەم**
**وا بە "لولاک" کردوویەتی وەسفی تۆ پەروەردگار**
**کافییە بۆ بەرزیی شەئنت مەعدەنی کەرەم**

"بێبەش"

"مەلا حەسەن هەورامی" تکا لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەکات کە داوا لە خودا بکات، بەڵکوو شیفای بدات و دەڵێت بە نووری پاکی خۆت داوای شیفام بۆ بکە ئەی خاوەنی تاجی "لولاک".

لە ئەدەبی تەسەوف و عەقیدەی زۆرینەی ئەشعەرییەکاندا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) خیلقەتی لە نوورە و لەسەر سیمای بەشەر هاتووە، ئەمەش بە پشتبەستن بە ئایەتی[قَدْ جَاءَكُمْ مِنَ اللَّهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُبِينٌ].

**شەفا خواهیم کەر بە نوور پاکت**
**باجەتی شەرەف تاج لولاکت**

"مەلا حەسەن هەورامی"

ئەی ئەوەی لولاک بێت ناوی بەرزی تۆ، تۆ هۆکاری نوور و ڕۆشنایی منی، فیدای تۆ بێت گیان و جەستەم، بە تۆوە ڕووناکە رۆح و گیانم. ئەمەش یەکێکە لە دەربڕینەکانی "محەمەد بالیسانی" بۆ پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێت).

**فیدای تۆیە جان و تەن ڕەوشەن بە تۆ ڕۆح و بەدەن**
**"لولاک" نابو هیچ وەتەن ئەی مایەی ئەنواری من**

"محەمەد بالیسانی"

"سەیدی مەهابادی" لە حاڵێکی عیرفانیی برینداربییەوە داوای لوتف و کەرەمی پێغەمبەر دەکات (درووودی خودای لەسەر بێت)، کە لەبەر ئەو زاتە بووە خودا تەواوی کەون و گەردوونی ئافراندووە.

**هەم لەبەر تۆ بوو دە عەرش و جەمعی ئەفلاکی زەمین**
**پێم کەرەم کە ڕەحمی وەصڵی خۆشکەوە زام و برین**

"سەیدی مەهابادی"

"مەزڵوم" وەک بیرخستنەوەیەک کە دەبێت ڕەچاوی فەرموودەی پێغەمبەر بکەین (درووودی خوای لەسەر بێت)، لە بارەی خاکیبوونەوە.

**تەوازع بکە لەگەڵ هەموو کەس**
**فەرموودەی حەزرەت شاهی لەولاکە**

"مەزڵوم"

ئەمەش وەسفێکی تری پێغەمبەرە (درووودی خوای لەسەر بێت) لە زاری "مەزڵوم"ەوە، هەروەها دووپاتکردنەوەی ڕاستیی قەولەکەیە.

**ئەو مستەفایە دۆستی خوایە**

**لەبەر ئەو دنیاش هاتۆتە كایە**

"مەزڵوم"

لێرە "مەزڵوم" خۆی دەناسێنێت بەوەی بەندەی كێیە و كێ پێغەمبەریەتی، ئیتر بە شاهی لەولاک ناوی دەبات.

**مەعبوودی حەقم یەزدانی تاکە**

**پێغەمبەری من شاهی لەولاکە**

"مەزڵوم"

"عاصی" خۆی دەخیلی قاپیی پێغەمبەر دەكات (دروودی خوای لەسەر بێت) و بە شاهی لەولاک ناوی دەبات، سا بەڵكوو مەرحەبایەكی لێ بفەرمووێت.

**سەد دەخیل ئەی شاهی لەولاک تۆش بفەرموو مەرحەبا**

**چونکە ڕێزگرتن لە میوان خۆت پەسندت فەرمووە**

**سەد دەخیل ئەی شاهی لەولاک ڕوو کە دەرد و زیللەتم**

**دەوری تاجی مورسەلینان یا رسول اللە دەخیل**

"عاصی"

# بەشی شەشەم
# خۆبەنزمزانینی شاعیرانی کلاسیکی کورد

لەم بەشەدا ڕووم کردۆتە دیوێکی هەستیاری شیعری کلاسیکی کوردی، دەمەوێ ئەو حاڵەتە تا ڕادەیەک "مەعدوومی"یە باس بکەم کە شاعیران پیایدا تێپەڕ دەبن، لە ئاست خودی مەعشووقەکانیان خۆیان لە ئاستێکی نزم وێنا دەکەن و دەیخەنە چوارچێوەی دەقێکی ئەدەبییەوە، وەک ئەوەی دەکەونە ژێر پێی یار و گەردی تۆزی پێ و خاکی ڕێگە و سەگی بەر قاپی و... هتد.

ئەم نزمبوونەوەیە هەندێک جار و لەلای بەشێک لە شاعیرەکانیان لە دەقە شیعرییەکانیاندا دەگەنە ئاستی "عبد" و "معبود".

هەروەها شاعیران لە وەسف و سەنای پێغەبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) دەکەونە ناو هەمان دۆخ و خۆیان چوواندووە بە سەگی دەرگای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت). لەلای هەندێک شاعیری تر، تەنانەت دەبن بە سەگی بەر دەرگای شێخ و کەسایەتییە ئایینییەکانیش.

دیارە ئەم تەنازولانە لە ئەدەبیاتی عیرفانیدا زیادەڕۆییە و بە هیچ شێوەیەک و بە هەر بیانوویەک ناشێت مرۆڤ خۆی بە ئاژەڵبچووێنێت، چ بە کردەوە و چ بە دەربڕین و جموجۆڵی جەستەیی و یان هەر ناوێکی تر.

بەڵێ، سەگ گرنگی و ڕێزی خۆی هەیە وەک هەر بوونەوەرێکی تر، بەڵام نەک ببێتە هاوشانی مرۆڤ، جا بە هەر بیانوویەک بێت.

ئاخۆ خودی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێت) ئەوەی قبووڵە مرۆڤێکی تر شکۆمەندیی خۆی بخاتە ژێر پرسیار و خۆی بە ئاژەڵ بچووێنێت! ئەمە لە کاتێکدایە خودای گەورە دەفەرمووێت:[وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ].

ئەم دەربڕینە بۆ پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێت)، جێگەی هەڵوەستە لەسەرکردن بێت، ئەدی بۆ عیشقی زەمینی و ڕەگەزی بەرامبەر و تەنانەت کەسایەتییەکان چۆن مامەڵە بکەین؟

لە کۆی گشتیدا دەمەوێت ئەوە بڵێم: ئەمانە هەر چەند وەک ئەدەب مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، بەڵام بیرمان نەچێت دواجار بارە بەسەر شاعیرەکانەوە و دەکرێت خوێندنەوەی بۆ بکرێت.

تاکە شاعیرێک پاساو بهێنێتەوە و وەڵامی ئەو بۆچوونە بداتەوە، "سالم"ە. ئەو دەڵێت لۆمەی مەجنوون مەکەن و پێی مەڵێن بە ماچکردنی سەگی بەر ماڵی لەیلا پایەی نزم بووەتەوە، چونکە عاشق بە پێچەوانەی عەقڵەوە ئەو سووکییە؛ پایەبەرزییە بۆی.

**مەڵێن "مەجنوون" شکا شکانی لە بۆسینی سەگی "لەیلا"**
**لەلای عاشق، خیلافی عاقڵی، ئەو هەتکە تەمکین بوو!**

"سالم"

هەروەها لە شوێنێکی تردا "سالم" دەرکی بەوە کردووە دواجار ئەم ستایلی دەربڕینە جۆرێک لە شەرمەندەیی بەدواوە دێت، کاتێک دەڵێت ئەگەر منیش بەڕاستگۆیی ببمە مەجنوون و کەڵکەڵەی لەیلا بکەوێتە سەرم و گیرۆدەی ببم، شەرم و شوورەیی و خەوشیش

بێ لەبەر ئەوەی لەبەر دەرگای یاردا دەکەوم، هەر سەگی بەر دەرگاکەی دەبێتە هاودەمم.

**بە مەجنوونی لە صیدقا گەر منیش لەیلا پەرستی کەم**

**سەگی دەرگاهی یارە موونیسم، گەر نەنگە، وەر عارە**

"سالم"

**نموونەی دەقەشیعرییەکان ئەمانەن:**

"نالی" لەم دێڕە شیعرییەدا وا خۆی دەناسێنێت کە سەگێکی بێوەفایە و قسەی نارێک دەکات، کە وایە بۆچی بانگی ناکەیت و لای لێ ناکەیتەوە پاروویەک نانی بدەرێ، ئیدی بێدەنگ دەبێت و "نا"ی لە دەمدا نامێنێت.

**دوور لە تۆ، "نالی" سەگێکە بێوەفایە هەرزەگۆ**

**بۆچی بانگی ناکەی ئەم کەلبە نانی نانییە**

"نالی"

"نالی" دەڵێت من هەمیشە سەگی بەر دەگای یارم و بەدکاریش لەکۆڵم نابێتەوە و پێم دەڵێت ئەگەر تۆ سەگی بەر دەرگای یاری، ئەوا منیش مێش و مەگەسی سەر لاشەی سەگم و بەری چاوت لێ دەگرم، ناهێڵم چاوت بە یارەکەت بکەوێت.

**هەر لەحزە دەڵێم من سەگی دەرگام و ڕەقیبیش**

**دێتە سەرچاوم کە منیش سەگ مەگەسێکم**

"نالی"

"نالی" لەم بەیتەدا زیاتر سنووری خۆبەكەمزانین دەبەزێنێت و خۆی وا دەناسێنێت كە سەگی بەر دەرگای سەگی ئەو ناوچەیەیە كە لەو سەگانەیە ڕاهێنراو و بێدەنگە و هەرا نانێتەوە.

**"نالی" كە وا سەگی سەگی ئەو مەرز بوومەیە**

**ئەمما سەگی موعەللەمی بێ دەنگ و بێ وەڕە**

"نالی"

"نالی" لێرەوە دوو ڕووداوی مێژوویی و ئایینی ئاوێتەی یەك دەكات كە یەكێكیان خەوتنی یارانی ئەشكەوتە (اصحاب الكهف) و ئەوی تریش كۆچی پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر بێت) لە مەككەوە بۆ مەدینە، ئیدی لەو سۆنگەیەوە بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەڵێت ئەی ئەو كەسەی كە وەك ئەشكەوتی پەناگای هەموو ئادەمیزادی نەك تەنها هیی "اصحاب الكهف" و یاوەرەكانی خۆت كە كۆچیان كردە لات كە ئەوان وەك یارانی ئەشكەوت نەبوون خەو بیانباتەوە، دە كە وایە "نالی" بكە بە خۆڵی بەر پێی خزمەتكاری سەگی بەر دەرگای خۆت، بەڵكوو لە بەرەكەتی مەدینەوە كە جێگای تۆیە، گەڕۆڵ و خورشتی من دابمركێتەوە و ئارامشیی بەر بكەوێ.

**"كهف الانام"ی هیجرەتی ئەسحابی بێ ڕوقوود**

**بیكە بە خاكی خادیمی قیتمیری ئەو دەرە**

**بەڵكوو لە فەڕڕی تەیبە كە تیبی پەیەمبەرە**

**ساكن ببێ گەڕۆڵیی ئەو كەلبە بێفەڕە**

"نالی"

"نـالی" ئامـاژە بـەوە دەكـات لـە سـەرەتادا  لەبـەر خراپـی و گوناهبارییەوە ڕووی ئەوەی نەبووە پێ بنێتە خاكی چاكی پاكی مەدینە، تا دواتر دەیبیستێت خۆ دەریا بە دەمی سەگ پیس نابێت، دەڵێت با منیش سەگ بم، بەڵام دەریای شینی ئیحسان بە من پیس نابێت، ئیدی بەم گوزارشتە ڕەوایەتی بە خۆی دەدات بچێتە مەدینە.

**نەبوو ڕووم بێمە خاكی چاكی پاكی تەیبە تا بیستم**
**بە سەگ نابێ مولەووەس ئاوی زەرقا بەحری ئیحسانە**

"نالی"

"نالی" لە چامە بەناوبانگەكەیدا كە بۆ "سالم" دەینووسێت، خۆی دەكات بە قوربانی تۆزی ڕێگەكەی، ئەمەشیان جۆرێكی ترە لە دابەزین بۆ ئاستی ژێر پێی هاوڕێیەكەی خۆی.

**قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مروور**
**ئەی پەیكی شارەزا بە هەموو شاری شارەزوور**

"نالی"

لای "نـالی" دەمێنینـەوە، ئـەم جـارەیـان سـەری خـۆی وەك بەردەبازی ژێر پێی یار دادەنێت بۆ ئەوەی یار پێی بنێتە سەری و بە سەریدا ڕاگوزەر بكات و دڵیشی ئەلهای خاكی ژێر پێی دەكات.

**سەر بەردەبازی ڕێتە، تەن تەختە بەندی جێتە**
**دڵ مەیلی خاكی پێتە، ڕۆح ماڵی خۆتە بیبە**

"نالی"

"مەولـەوی" سـوودی وەرگرتـووە لـە پەنـدێکی کـوردی کـە دەڵێـت "سـەگ بـە هاوسـایەی کـام مـاڵ بنـازێ"، دیـارە لـە بێفیـزی و خۆشویستنی شێخەوە خۆی لەو ئاستەدا وێنا کردووە.

**لە "مەولەوی"یەوە بۆ "شێخ بهاالدین":**

**ئای هەنی جەی دەردکێ دەرمان سازۆ؟**
**وە هەمسایە سەگ کام دەرماڵ نازۆ؟**

"مەولەوی"

"مەحوی" پێی یار وەکوو تاجی سەری پادشاکان دەشوبهێنێت و سـەری خۆیشـی بە سـەری گەدا دەچووێنێت، لـەم نێوەندەشـدا بـە مەحاڵ دەزانێت تاجی سەری پادشا بکەوێتە ژێر پێی گەداکان.

**مەحاڵە بێتوو ئەو پێ سەر سەرم نێ**
**بـە تـاجی پادشـا ناگـا گـەدا قـەت**

"مەحوی"

هەر چەندە "مەحوی" خۆی دەکاتە خاکی بەر پێی یار، بەڵام یار بە سەریدا ڕاگوزەر ناکات، ئیدی جگە لە قورپێوان، چی بکات!

**لـە ڕێـی ئـەو شـۆخەدا خـۆم کـردە خـاک و پێـی نـەنا پێمـا**
**دەسا خاکی هەموو عالەم بەسەر خۆما نەکەم، چ بکەم؟**

"مەحوی"

دەستم بە دامێنی سەگی بەر دەرگاتان ئەی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێت)، بەیەکجاری با سەربەرز بم بـەوەی بفـەرمووی ئەوە سەگی بەر دەرگای خۆمانە.

ئینجا "مەحوی"یش هەروەکوو "جامی" کە یەکێکە لە شاعیرە عیرفانییەکانی ئێران، دەڵێت من سەگێکی گەڕی جگەرتینوو و دەم وشکهەڵاتووم، داوای دڵۆپە ئاوی دەریای چاکەی تۆ دەکەم، بەڵکوو جۆشی گەرمیی خۆمی پێ دابمرکێنمەوە.

دواتر "مەحوی" ئاماژە بە سەگەکەی یارانی ئەشکەوت دەکات و ڕووەو پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەڵێت تۆش من لە ئەشکەوتەکەی خۆتا ڕێ بکەرەوە و بە سەگی یارانی خۆتم قبووڵ بفەرمووو، بەڵکوو بە هۆی ئەوانەوە خودا بەزەیی پیامدا بێتەوە.

**دەخیلی ئەو سەگی بەر قاپییەم جارێ بەیەکجاری**
**سەرئەفرازم بکە، فەرمووو: سەگی بەر دەرکی خۆمانە**
**وەکوو "جامی" دەڵێ، دەم وشکهەڵاتوو من سەگێکی گەڕ**
**جگەر تینووم و دەخوازم نمێ لەو بەحری ئیحسانە**
**بە یەک دوو قەترە تێر ئاوی حەیاتی کە وەکوو قیتمیر**
**لە کەهفی خۆتیا ڕێ دە، سەگی ئەسحابی خۆتانە**

"مەحوی"

"وەفایی" باس لە بێوەفایی یار دەکات کاتێک وەک سەگی بەر دەرگا بەخۆڕایی خزمەت دەکات، کەچی ئەویش بێمروەتانە وەک نێچیر تیربارانی دەکات و دەیکوژێت.

**ئاخر سەگی خاکی دەری تۆ بووم بەخۆڕایی**
**مرووەت نەبوو تیغت لە سەری سەییدی حەرەم دا**

"وەفایی"

هەر کەسێک لەبەر دەرگەی تۆدا ئارام بگرێت، دانیشتووی وڵاتی بەهەشتە. دەی خۆ لە لوتفی تۆ کەم نابێت من لە ڕیزی سەگەکانی تۆ بم، سا بەڵکوو ئارامییشم دەست بکەوێت!

**موقیمی خاکی دەرکەی تۆ حەریمی جەننەتە جێگای**
**بە لوتفی تۆ چ بکەم نابێ منیش ڕیزەی سەگانت بم**

"وەفایی"

ڕێگایەک کە تۆ پێیدا ڕاگوزەر دەکەیت، بۆنی گوڵ و عەنبەری لێ دێت و منیش خاکی بەر پێی تۆم ئەی ڕۆحی شیرینم، وا چاکە لە من زیز نەبی.

**ئەتۆ گوڵ عەنبەرین ڕێی تۆ، ئەمن خاکی بەری پێی تۆ**
**لە من تۆ زیز نەبی چاکە، عەزیزم، ڕۆحی شیرینم**

"وەفایی"

"وەفایی" دەڵێت تەنها جارێک پێم بڵێی "وەفایی" سەگی پێغەمبەرە، ئیدی ئەم فەزڵە ناگۆڕمەوە بە هەموو دەوڵەتی دونیا و قیامەت.

**نایدەم بە هەموو دەوڵەتی دنیا و قیامەت**
**جارێ بە "وەفایی" کە بڵێ کەلبی ئەمینە**

"وەفایی"

"وەفایی" پێی وایە خاکی سەر ڕێگای دولبەرەکەی سورمە و کوحلی چاوی پڕ لە خوێنیەتی، داواش لە سەگەکەی سەر ڕێگای لەیلێ دەکات کە بەڵکوو بچێتە سەردانی و دوو چاوە پڕ لە خوێنەکانی مەجنوون ببینێت.

**خاکی ڕێی دولبەری وە بزانێ سورمەیە بۆ چاوی پڕ خوون**
**سەگەکەی ڕێبازی لەیلێ وەرە سەر دوو چاوی مەجنوون**

"وەفایی"

"سالم" ڕووی جوانپەرستی لە یارەکەی دەکات و دەڵێت وەک چۆن زوڵف و ئەگریجەت سەری شۆڕ دەبێتەوە و مەیلی بەرەو خوار دەکات، سەری منیش وا خوار دەبێتەوە، بەڵام بۆ بەر پێت و حەزی ژێر پێت دەکات، سا توو بی خودا ئەی بتە شۆخەکەم، ستەمم لێ مەکە و سەرم لەبەر پێی خۆت لا مەدە و بە دوورخستنەوە ئازاری پێ مەگەیەنە.

**مایلە، وەک سەری زوڵفت، سەری من بۆ بەری پا**
**بە جەفا مەیخەرە لا، سا صەنەما! توو بی خودا**

"سالم"

ڕوون نییە بۆچی "سالم" بەبێ هۆ، خۆی بە گورگی باراندیدە بە واتای گورگی سزادیو دەچووێنێت!

بەدکار وەک "سالم" خۆگر و تین و توانای بێمەیلیی یاری نەبوو، دیارە بارێکی گرانە، بەم جۆرە ڕەقیبی سەگ لە قاتوقڕی و بێمەیلیی یاردا تۆپی، بەڵام گورگی سزادیو کە "سالم"ە، مایەوە و نەمرد!

**تابی بێمیهری نەبوو یەک دەم، وەکوو "سالم" ڕەقیب**
**سەگ بە تۆپین چوو لە قەحطا گورگی باران دیدە ما**

"سالم"

بۆ کاری ڕاوچییەتی، من سەگی شارەزام کە بەدوای نێچیردا بگەڕێم، بهێڵە کۆت و زنجیر لە مل نەبم، من هیی ئەوە نیم لە دەستت ڕابکەم.

**بۆ شکارت منم سەگی عاریف**
**بێڵە با بێ قەڵادە بم، تا بم**

"سالم"

"سالم" بۆ جەنگ لەگەڵ بەدکار بەتەنها نییە و پشتیوانەکەی سەگی بەر دەرگای یارە کە ئەویش وەک ئەم کڵۆڵ و بێبەشە، بەمەش سالم دەبێتە هاوتای سەگی بەر دەرگای یار.

**پشتیوانم هەیە بۆ مەعرەکە و جەنگی ڕەقیب**
**سەگی دەرگانەیی یار و منی غەمدیدە یەکین**

"سالم"

ساردوسڕی لە خۆشەویستیدا لە نێوانمان هەیە، بۆیە دەبێ بزانرێ "سالم" سەر بە کێیە، وەک چۆن سەگ بە ناوی خاوەنەکەیەوە دەناسرێتەوە.

**سەرد میهری وا لە بەینا، ناوی "سالم" گەر نەبەی**
**صاحیبی خۆی کەی دەناسێ، هەر سەگێ ناوی نەبێ**

"سالم"

ئەگەر مـوژدەیـەک ببێتە هـۆی ئـەوەی وا ڕێی سـەگی بـەر دەرگاکەت دوور بخاتەوە بۆ شوێنێکی نەزانراو، "سالم"ی داماو ئامادەیە لەبەر دەرگاتدا ببێ بە نۆکەر و پاسەوان.

**ئەگەر نەویدیٚ ڕێی سەگی قاپیت بەرن بۆ جێی غەریب**
**"سالم"ی میسکین لە دەرگا حەلقە دەرگۆشی دەکا**

"سالم"

"سالم" لە شوێنێکی تردا دەڵێت: ئەی خوداناس، من وەفاداری تۆم، بەتوندی کەمەندکێش کراوم بەرەو لای تۆ، ئیتر سەگی وەک سالم پێویستی بە ڕست و بە پەتی مل نییە پێی ببەسترێتەوە و بە زۆر بهێنرێتە لای تۆ.

**زەنجیری وەفا مەحکەم کێشامی بەلای تۆوە**
**عارف، سەگی وەک "سالم"حاجەت بە مەرەس نابیٚ**

"سالم"

"کوردی" تکا لە یار دەکات سا بەڵکوو دەستی بچێتە کوشتنی و یەکلایی ببێتەوە، کەچی یاریش پێی دەڵێ بۆ نازانی من نیازمەندی وەها نیم خەنجەرم بە خوێنی سەگ پیس بکەم؟

**ئیلتیماسی کوشتنم لێ کرد، وتی: نازانی تۆ**
**من چەپەڵ ناکەم لە خوێنی هەر سەگێکدا خەنجەرم**

"کوردی"

بە بۆنەی جەژنە پیرۆزەوە، "کوردی" شیعرێک بۆ عوسمان بەگی بابان دەنووسێت و خۆی بە قوربانی دەکات، تا ئەوەی دەبێتە قەڵغانی پارێزگاریی ئەو تیری حەسوودانەی بۆ عوسمان بەگی بابان ئاڕاستە دەکرێن. ئیدی لەو چوارچێوەیەدا ڕەزامەندە بەوەی گیانی لەبەر پێیدا وردوخاش بێت و ببێتە خۆڵی ژێر پێی و بە سەریدا ڕاگوزەر بکات.

**جانان وەرە ئەم جەژنە بەقوربانی سەرت بم**
**بۆ تیری قەضای حەسوودان سوپەرت بم**
**ڕاضیم بەدەنم هەروەکوو خاکی بەری پێت بێ**
**شایەد کە لە ڕێی مەدرەسەدا ڕەهگوزەرت بم**

"کوردی"

هەر ئەو ڕۆژە کە "کوردی" بەژن و باڵای ڕێک وەک داری سەروو دەبینێت، لەبەرامبەر جوانیی برۆی یاردا چارەیەکی نامێنێت، ئیدی لەوە دڵنیا دەبێت کڕنووشبردن بۆ ئەو قەد و باڵایە؛ ئەرکە.

**ئەو ڕۆژە قەدی تۆم دی، ناچاری خەمیدەت بووم**
**سوجدە بە یەقین فەرضە بۆ سەرووی خەرامانت**

"کوردی"

"بێخود"یش خۆی دەچووێنێ بە سەگەکەی یارانی ئەشکەوت و بەخاتری ئەوەی یاران لە ئاسایشیدا بحەوێنەوە، بەیانی هاتنی خۆی دەکات بۆ بەر دەرگای یاران.

**ئەمن "قیطمیر"ی ئێوە و ئێوە "اصحاب الرقیم"ی من**
**لە بۆ کەهفی ئەمانت وا سەگی دەرگاکەی خۆت هات**

"بێخود"

سەگ کە بە خاوەنەکەیەوە ناز دەکات، بۆیە "فەنایی" تا لە ژیاندا زیندووە، وەک سەگێکی لات ناز بەوە دەکات لە کۆڵانەکانی مەدینەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بژیەت.

**سەگ بەخۆی خۆی ئەنازێ بۆیە تا ماوم ئەڵێم**
**من سەگێکی لاتی کۆڵانی مەدینەی "مصطفی"م**

"فەنایی"

"فەنایی" لێرەدا سەری خۆی دەکاتە بەردەباز بۆ پەڕینەوەی یار، بەڵکوو یار لوتفی ئەوە بکات پێی بنێتە سەری و بە عیشوە و نازەوە هەنگاو بنێت.

**من سەرم دانا لە ڕێی ئەوسا بە شێوەی بەردەباز**
**بەڵکە دڵبەر بێ بەسەریا گا بە عیشوە گا بە ناز**

"فەنایی"

"فەنایی" دەگاتە ئەو باوەڕە ی کە تەمەنی ئاوێزانی باڵای یار بووە و بووە بە تۆزی پێی، ئیدی وا ئەزانێ تۆز و گەردی ڕێی یار؛ دەرمانی چاوە.

**من کە کاڵای عومرەکەم ئاڵا بە باڵا و تۆزی پێت**
**وام ئەزانی تۆزی پێت دەرمانی چاوی سەر ئەکا**

"فەنایی"

"حەریق" داوا لە پێغەمبەر دەکات (دروودی خوای لەسەر بێت) کە دەستی پیرۆزی بخاتە نێو دەستی شکاوی، ئیتر خۆی بە قوربانی سەگی بەر قاپی دەکات و تا دەگاتە ئەو ئاستەی ئامادەگیی تێدایە وەک سەگ پاسەوانی لەماڵەکەی بکات.

هەروەها وەک تاژی (تانجی) بەدوای خاوەنەکەی بکەوێت، ئاوا بەدوایەوە دەبێت، ئیتر دەڵێت حەیفە لێ گەڕێی ئەو سەگەی خۆت زیانی بەر بکەوێت.

**دەستێ بدەرە دەستی شکەستم بە عینایەت**
**قوربان بەفیدای قاپی سەگی قاپییەکەت بم**
**وە بزانە سەگم ڕامگرە بۆ حیفز و حیمایەت**
**وەک تازی لەدوی سەییدەوە من دەبمە توفەیلی**

**بەو شەرتە کە وا پەس نیگەریت بێ بە عینایەت**
**حەیفـە سـەگی قاپییـەت لـە زیانا بـێ، زمـانی**

"حەریق"

"حـەریق" دەڵێـت گیـان و دڵ و دیـنم هەرسـێکیان بـەیەکـەوە بەجارێک ببنە قوربانی یەک سەعاتی ئەو لێوە سوورەت کە وەک "مـەرجان"ە، مەبەسـتی مـن دەرخسـتنە بـۆ نموونـەی مـەدح و پێداهەڵدانت و هەروەها بۆ دەرخستنی وەسفی گوڵی باغی تۆ.

**ڕۆح و دڵ و دین هەرسێ مەجموع بە یەک دەفعە**
**قوربـانی سـەعاتێکی لـەعلی لـەبی مـەرجانت**
**مەقسوودی من ئیزهارە بۆ ئەمسیلەیی مەدحت**
**بـۆ توحفـەیی ئەوسـافی ئـەزهاری گوڵسـتانت**

"حەریق"

"سافی هیرانی" هەتا ڕۆژی دوایی ئەو مەقام و پلەوپایەی بەسە کە تـەنها بۆ یـەک جـاری تـر یـار پێی بڵێت "سـافی" سـەگی بـەر دەرگای منە.

**ئەگەر جارێکی تر فەرمووی سەگی دەرگای منە "صافی"**
**هەتا مەحشەر بەسە بۆ من مەقامی غەیری تۆ جاهم**

"سافی هیرانی"

"کەمالی" دەڵێت ئەگەر سەری من نەبێتە بەردەبازی ژێر پێی تۆ، ئیدی هەر بۆ ئەوە باشە بکەوێتە ژێر پێی دوژنەوە.

**سەرم گەر بەردەبازی ڕێت نەبێ پێ شێلی دوژمن بێ**
**دڵم گەر فەرشی بەر پێی تۆ نەبێ با ئەنجن ئەنجن بێ**

"کەمالی"

"ناری" دەچێتە چوارچێوەی ئەو بەراوردکارییەی نێوان خۆی و سەگەکەی یارانی ئەشکەوت، شیعرێک تەخمیس لەسەر شیعرێکی "تاهیر بەگی جاف" دەکات و دەڵێت ئەو سەگە لە بەهەشتی خوادادایە و منیش کەوتوومەتە دۆزەخەوە.

**ئەگەر سەگی دوای فەوجی خاسانی خودایی کەوتووە**
**یانی دەربـاری دەری ئەصـحابی کـەهفی گرتـووە**
**ئەو لە جەنـەتتادا مـوقیم و مـن لـە دۆزەخـدا بـووە**
**ئـەی حـەبیبی خـالیقی عالـەم تـەرەحوم تـا زووە**
**ئەو سەگی ئەصحابی کەهف و من سەگی تابیعین**

"ناری"

"ناری" سەری خۆی دەکاتە بەردەبازی ڕێگەی یار، چونکە پێی وایە مەرهەم و دەوای دەردی سەری "ناری"، خۆڵ و گەردی ژێر پێی یارەکەیەتی.

**وا سـەرم دانـا بـە عـەزمی بـەردەبازی ڕێـگەکەت**
**مەرهەمی دەردی سەری من وا بە گەردی پاتەوە**

"ناری"

لە نامەیەکدا کە بۆ "شێخ مەحموودی حەفیزادە" نووسراوە، "ناری" ڕۆح و دڵی خۆی دەکاتە قوربانی ئەو پارچە ئاسنە بچووکەی ژێر پێڵاوی شێخ مەحموود و سەری خۆیشی بە سەرگەرد و قوربانی حەوش و حەسارەکەی دەکات، چونکە هەردەم ئاتاج بەوە و پڕ کەیلە بۆ یادی دڵ و دەروونە پاک و بێگەردەکەی شێخ مەحموود.

**ڕۆح و دڵ قوربـانی نـاڵی كەوشـەكەت**
**سەرە سەر گەردی حەساری حەوشەكەت**
**دائیمـا موحتـاج و موشـتاقم لـە بـۆ**
**گـەنجی یـادی خـاتری بێخەوشـەكەت**

"ناری"

"سەیید كامیلی ئیمامی" بە دڵ باڵ دەگرێت بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)، هەر بەئومێدی ئەوەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بە سەگی بەر دەرگای خۆی قبووڵی بكات.

**بۆ مەدینە باڵی لێک دا تەیری دڵ ڕۆیی گوتی**
**گەر قەبووڵم كا بە ئاڵاكەی سەگی پێغەمبەرم**

"سەیید كامیلی ئیمامی"

هەر لێرەوە "سەیید كامیلی ئیمامی" لەگەڵ ئەو خۆبەنزمگرتنەی كە هەیە، تەنانەت سنووری جوێندان بە خودی خۆیشی دەشكێنێت. دەڵێت:

**بێ پاس و وەڕ و خوێڕی وەک سەگ لە قەسابخانە**
**بێهـۆش و سەراسـیمە وەک مەسـتێ لـە مەیخانـە**

"سەیید كامیلی ئیمامی"

بە "سەیید كامیلی ئیمامی" وتراوە خاكی بەر پێی یار سورمە و كوحلە، ئیدی هەڵوەدای دەستكەوتنی ئەو سورمەیە دەبێت بۆ چاوی بۆ ئەوەی نەیارەكانیشی پێی كوێر بن. كارێكی وەها نەكات، ئەی چی بكات؟

**دەڵێن یار خاکی بەر پێی سورمەیە بۆ چاومی دێنم**
**بە کوێرایی ڕەقیبی لامەزەب ئەی وا نەکەم، چ بکەم؟**

"سەیید کامیلی ئیمامی"

لە زمانی کوردیدا وشەی "وەرکەوتن "تەنها بۆ گیانداران بەگشتی و بۆ سەگ بەتایبەتی بەکار دێت، کەچی "سەیید کامیلی ئیمامی" لێرە ئەم وشەیە بەکار دەهێنێت بۆ وەسفی خۆی.

**هەستە "کامیل" بەسیە بێداری، بڕۆ لێی وەر کەوە!**
**تا وڵات بێ دەنگوباسە و تا لە ڕۆژ میوانە شەو**

"سەیید کامیلی ئیمامی"

لە ئاکامی تەوبەکردنەکەیدا، "سەیید کامیلی ئیمامی" خۆی دەناسێنێت وەک سەگێکی ڕووت و ڕەجاڵ و گوێڕایەڵی ڕانی مالاتی (پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت).

**من سەگێکی ڕووتوقووتی ڕانەکەی تۆم تۆبە، بێ**
**پەت لە مل، ئامادەباشی شوانەکەی تۆم، تۆبە بێ**
**هەستە "کامیل" ڕوو دەرکی سەییدی سەروەر بکە**
**هەر بڵێ قوربان! سەگی ئاستانەکەی تۆم، تۆبە بێ!**

"سەیید کامیلی ئیمامی"

لەم تەوبەکارییەدا "حەمدی"یش ئەگەر لە هەر بارودۆخ و پلەوپایەیەک بێت، بەڵام دواجار گومانێک ناهێڵێتەوە، بە دەربڕینی خۆی، هەر سەگەکەی سەر سەکۆی پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر بێت).

**یا محەمەد ڕووڕەشی دەرگانەکەی تۆم، تۆبە بێ**
**هەر چی هەم، بێشک سەگی ئاستانەکەی تۆم، تۆبە بێ**

"حەمدی"

"حەمدی" ئەو تۆز و خۆڵەیە کە دەنیشێتە سەر دامەنی یار و ماچی بەر پێی دەکات، ئەم بارودۆخەش بە چاکەکردن دەزانێت.

**وەکوو گەرد دامەنم گرتووی و ماچی ئەکەم بەر پێت**

**مەڵێ چاکەت چییە تۆ یا بکەم ئەم چاکەیە بۆ کێت**

"حەمدی"

"حاجی قادری کۆیی" لێرەدا بەئاگا و دیار و بەرچاوە کە سەگی مەجنوونە بۆ غەمخواردنی لەیلا.

**دەزانی من کە بێدار و دیارم**

**سەگی مەجنوونم و غەمخواری لەیلا**

"حاجی قادری کۆیی"

هەرکە "حاجی قادری کۆیی" دەیبیستێت یار بە سەگی بەر دەرگای خۆی پەسەندی کردووە، ئیدی خەم و ترسی لە بەدکار و نەیاری نامێنێت و خۆی پەناگیری یار کردووە.

**هەرکە بیستم پێم دەڵێ: حاجی سەگی دەرگانەمە**

**من لە ترسی گورگی بەدکارم، کەری خۆم بەستەوە**

"حاجی قادری کۆیی"

"تاهیر بەگی جاف" ژیانی خۆی پەیوەست دەکات بە "بیارە" و ماڵەکەی شێخ و خۆزگە بە سەگەکەی بەر دەرگای قوتبی مەددار (شێخی تەریقەتی نەقشبەندی) دەخوازێت.

قطب المدار: پایەیەکی بەرزی پیاوانی تەریقەتە، پێیان وایە دەتوانن هەڵسوکەوت بە جیهانی ڕۆح و ماددەدا بکەن.

**مەربووتــە حــەیاتم بــە بیــارە و بــە دیــاری**
**خۆزگەم بە سەگی قاپییەکەی قوتبی مەداری**

"تاهیر بەگی جاف"

"تاهیر بەگی جاف" داوای سۆز و بەزەیی لە پێغەمبەر دەکات (دروودی خوای لەسەر بێت) و پێی دەڵێت مادام سەگی یارانی ئەشکەوت (اصحاب الكهف) هەیە و دەچێتە بەهەشتەوە، ئیدی با منیش سەگی شوێنکەوتووانی تۆ بم.

**ئــەی حــەبیبی خــالیقی عالــەم تــەرەحوم تــا زووە**
**ئەو سەگی ئەصحابی کەهف و من سەگی تابیعین**

"تاهیر بەگی جاف"

هەر چی مولکی عەجەم و ڕۆمە لەلای "تاهیر بەگی جاف" ئەرزشی ماچی لێوی یاری نییە، هەروەها هۆزی مامەش و هۆزی بلباس دەکاتە قوربانی یەک نیگای یار، لەبەر ئەوە تەسلیم بە جوانیی یار دەبێت و لەو پێناوەدا سەری خۆی دەخاتە ژێر پێی یار، دەی کەواتە ئەی یار چیتر باس و لۆمەم مەی مەکە!

**مـوڵکی عەجـەم و ڕۆمـە بـەهای بۆسـەیی لێـوی**
**دەیکەم بە فیدای یەک نیگەهی مامش و بڵباس**
**تـاهیر سـەری تەسـلیمە لەبـەر خـاکی بـەری پێـت**
**دایـنـاوە ئیتـر حەیفـە مەکـە، بەسـیە، قسـەوباس**

"تاهیر بەگی جاف"

کە "تاهیر بەگی جاف" سوجدە بۆ برۆی یار بەرێت، ئیتر نایەوێ وەک زاهیدەکان بۆ مەوعیدی چوونە بەهەشتی خوداوە لە خەمی خۆیدا بێت.

**کە من میحرابی ئەبرۆی تۆ مەقامی سوجدەگاهم بێ**
**ئیتر وەک زاهیدی خودبین لە مەوعیدی جینانم چی**

"تاهیر بەگی جاف"

"قانع"یش لەم دێڕەدا چیی داوە لە میحراب و مزگەوتی کۆن و خواروخێچ و دوورەدەست، کاتێک تاقی برۆی یار؛ مەقامی کڕنووشی بەیانیانی بێت.

**هەتا تاقی برۆی تۆ بێ لە بۆ سوجدەی سەحەرگاهم**
**لە مزگەوتی کەچ و کووڕ و لە میحرابی کەنارم چی**

"قانع"

"قانع" وەک ئەو مێشومەگەسانەیە کە بەسەر گیان و لاشەی سەگەوە گزەگزیانە و بە دەوریەوە دەخولێنەوە، چونکە پێی وایە خاکی ژێر پێی سەگی یار بۆ ئەو وەک شەکەر شیرینە، دیارە مێش و مەگەسیش بەدوای شتی شیرینەوەن.

**سەگ مەگەس وار لەدەوری سەگەکەت دێمە تەواف**
**خاکی ژێر پێی سەگەکەت بۆ مەگەسی دڵ شەکەرە**

"قانع"

"قانع" ڕوو دەکاتە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) و پێی دەڵێت ئەی چاکترین بەشەر، من سەگی ئەو کەسەشم کە حەزی لە سوورەتی "طە"یە، چونکە یەکێک لە ناوەکانی تۆ؛ "طە"یە.

**دەستی من دامێنی تۆ یا حەزرەتی خەیرولبەشەر**
**من سەگی ئەومە کە مەیلی سوورەتی "طه" ئەکا**

"قانع"

"قانع" لێرەدا داوا لە خودا دەکات بەزەیی پیا بێتەوە لەدەست شـۆخە بێپەروایەکـەی دادەدادیـەتی، چونکـە خـۆی ناتوانێـت چارەسەری حاڵ و گرفتاریی خۆی بکات، بۆیە پەنا بۆ خودا دەبات و داوای مردنـی لـێ دەخوازێـت، سـا بـەڵکوو زوو جەسـتەکەی دووبارە ببێتەوە بە خاک و بکەوێتەوە ژێر پێی لەیلا.

**خوا ڕەحمێ بە حاڵم کەی لەدەست ئەو شۆخە بێپەروا**
**کە سوڵحی ناکرێ بۆ من بە دوو سەد مەحکەمەی کوبرا**
**ئەجـەل تـۆ بمکـوژە و گـۆڕیش دەبـا زوو ڕێزەڕێـزەم کـا**
**کـە بـەڵکوو بـم بـە خاشـاکی بـەری دەرگانەکـەی لـەیلا**

"قانع"

"قانع" بۆ "شێخ محەمەدی خاڵ" دەڵێت من بەفیدای خـاکی بـەری پێت بم، ئـەی ئـەو کەسـەی ڕووناکی دەبەخشیتە دڵ و دینم، تۆ بنیاتنەری عەقڵ و شکۆمەندیی منی.

**فیدای خاکی بەری پێت بم، زیا بەخشی دڵ و دینم**
**بناغەی مەنبەعی عەقڵ و ئەساسی عیزز و تەمکینم**

"قانع"

"حەیدەری" خۆی دەچووێنێت بە سـەگێک دەچێتە بەر دەرگای (پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێت)، چونکە هیچ بەهاناوەچوون

و پەناگەیەک شک نابات، جگە لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت).

**سەگێکم من وەها کەوتووم لە پێشی دەرگات بێ مەلجەء**
**بە غەیری تۆ نییە کەس بێتە هانام "یا رسول اللە"**

"حەیدەری"

"وەلی دێوانە" بانگی سەگی بەر دەرگای ماڵی یار دەکات کە پاسەوان و هاوڕێ و هاوڕازی دڵدارەکەشیەتی، بۆیە خاکی ژێر پێی ئەو سەگە بە دەرمان بۆ چاوی پڕ ئازاری خۆی دەزانێت.

**سەگی دەرگای یار، سەگی دەرگای یار**
**سەگی پاسەوان پێش قاپی دڵدار**
**هاوڕێ و هاوڕازی گشتی کاتی نازدار**
**خاکی پێت دەرمان چاوی پڕ ئازار**

"وەلی دێوانە"

لەلای "وەلی دێوانە"، ئەو مردن و گیانەرچوونە شیرینە کە لەسەر خاکی ژێر پێی یار بێت.

**ئای کە چەند خۆشە ژیان و عومرم**
**لە خاک و پای تۆ گیان دەرچێ بمرم**

"وەلی دێوانە"

"زەبیحی" یاری بە بت دەناسێنێت و داوای لێ دەکات بە بەندەیەکی ڕاستگۆ قبووڵی بکات. هەروەها دەڵێت هەرگیز ڕێگە بە دوژمن مەدە، چونکە لە عیشق بێئاگایە.

**ئەی سەنەم عەرزم قبووڵ کە بەندەیەکی سادقم**
**قەت مەدە ڕێگەی ڕەقیب، چونکە لە عیشقێ غافڵە**

"زەبیحی"

"ناتیق" ئامادەیە سەری بخاتە ژێر پێی یار و بۆی ببێت بە بەردەباز، کەچی یار بەمەکرە و وەڵامی "نا"ی دەداتەوە و قبووڵی ناکات بەم نازلەسەرکردنەش دەیکوژێت، کەچی گلەییشی لێ دەکات و پێی دەڵێت ناتیق لە ڕێی من خۆی لا دەدات.

**ئـەڵێم سـەرم بکەمـە بـەردەبازت**
**مـەکربازە، جـوابی ئێمـە "نـا" ئـەدا**
**نـاز ئـەکات و ئـەمکوژێت و ئـەمبڕێ**
**ئەشڵی "ناتیق" لە مەسلەکم لا ئەدا**

"ناتیق"

کە "صابری" نەخۆش بێت و چاک نەبێتەوە؛ لێی مەگرن، هەتا ئەو کاتەی یار دێت و پێی دەنێتە سەر سەری، ئینجا کۆتایی بە ئێش و ئازارەکەی دەهێنێت.

**نەخۆشی سەرسەری "صابر" مەگەر چا بێتەوە ڕۆژێ**
**کە تۆ پێیە بنێیە سەر سەری کۆتا بێ ئۆف و ئاخ**

"صابری"

"ئەحمەدمەختار جاف" وەک خاکی بەر پێ دەکەوێت کە دولبەرەکەی بە سەریدا ڕاگوزەر دەکات، دەبێتە غوڵام و بەندەی یارە شۆخەکەی. ئەگەر ئەم بەندایەتییەی دەست بکەوێت، پێی

حــەیــف و خەســارەتمەندە تەنــەزوول بکــات و بچێتــە ڕیــزی ئەسکەندەری مەقدۆنی و دارا.

لێـرەدا دارا مەبەسـتی (داریـوس - داریـوش)ە، کـە پاشـای ئەخمینییـەکان بـوو لــە سـاڵانی (٣٣٦- ٣٣٠پ. ز.)، شـەڕێکـی خوێناویی بەرپا کرد لەگەڵ ئەسکەندەری مەقدۆنی.

**قوربان وەکوو خاکی بەری پێت کەوتووە دایم**
**"ئەحمەد" کە مەگەر دولبەری خۆی لە گوزەردا**

لە دێڕێکی تردا دەڵێت:

**غوڵامی و بەندەیی ئەو شۆخە گەر دەستم کەوێت حەیفە**
**تەنـەزول کـەم کـە بچمـە مەسـلەکی ئەسـکەندەر و دارا**

"ئەحمەدموختار جاف"

"ئەحمـەدموختار جـاف" دیسـانەوە بـە دڵ دەبێتـەوە بـە بەنـدەی بەر دەرگای یار و ئامادەیە لەو پێناوەشدا بمرێت و نەجاتی ببێت.

**قوربان غوڵامی قاپییەکەت "ئەحمەد"ە بە دڵ**
**سا بیکوژە لە دەرد و ئەلەم بیدە زوو نەجات**

"ئەحمەدموختار جاف"

"ئەحمەدموختار جاف" لێرەشـەدا ئامـادەیی دەردەبڕێـت تـا ببێتـە بەندەی بەر دەرگای یار، بۆ ئەوەی تۆز و گـەردی ژێر پێـی یاری بەر بکەوێت.

**ئەمەوێ من شەو و ڕۆژ خادیمی دەرگاهی بم**
**لەبـەر ئـەو دامەنـەدا خـاکی گوزەرگـاهی بـم**

"ئەحمەدموختار جاف"

ئەگەر یار ڕووی پێ نەدات و دەریبکات، بەڵام هەر خاکی بەر دەرگای یارەکەی قبووڵە بە تاجی سەری خۆی.

**ئەگەر بێت دەرمکەی بە خوا ڕۆژێ دوو سەد جار**
**هەر خاکی دەری تۆیە نیگار، تاجی سەری من**

"ئەحمەدموختار جاف"

لەم پێنجخشتەکییەدا "ئەحمەدموختار جاف" لەسەر شیعرێکی "تاهیر بەگی جاف"ی برا گەورەی دایڕشتووە، باس لە حاڵی خۆی دەکات تا کەی لە ئێش و ئازاری عیشقدا بژیت، ئیتر شەرت و پەیمان دەبەستێک کە ببێتە خاکی ژێر پێی یارەکەی، ئیدی ئەم شیعرەی "تاهیر بەگی جاف" دووبارە دەکاتەوە کە لە دەربڕینەکەیدا "تاهیر بەگی جاف" دەڵێت کە "تاهیر بەگی جاف" سوجدە بۆ برۆی یار بەرێت، ئیتر نایەوێ وەک زاهیدەکان بۆ مەوعیدی چوونە بەهەشتی خوداوە لە خەمی خۆیدا بێت.

ئیتر ئەوە عیشقە کاریگەریی لەسەر ئەو دوو برا بەگزادەیە کردووە بەم شێوەیە تەنەزوول بکەن، لە کاتێکدا کوڕانی وەسمان پاشای جاف و عادیلە خانم بوون، ئەوان بەگزادە و نازپەروەردەی بنەماڵەیەکی بەویقار و دەسەڵاتداری دیاری ناوچەی هەڵەبجە و هەورامان بوون.

**توو خوا قوربان عەفوو کە با کە من سەد جار گوناحم بێ**
**خوا هەڵناگرێ تا کەی هەمیشە ئۆف و ئاهم بێ**
**ئیتر شەرتێکە خاکی ژێر پێی تۆ من کولاهم بێ**
**کە من میحرابی ئەبرۆی تۆ مەقامی سوجدەگاهم بێ**

**ئیتـر وەک زاهیـدی خـودبین لـە مەوعیـدی جینـانم چـی**

"ئەحمەدموختار جاف"

"زێوەر" دەپرسێت چۆن دەستی بگاتە خاکی بەر پێی یار، کە نیازمەندی ئەوەیە بەیەکجاری تەرکی دونیا بکات!

**ئەمن وەک زەڕڕەیی بێ جیلوە، تۆ خورشیدی عالەمگیر**
**چلـۆن دەسـتم بگاتـە خـاکی پـاکی چـاکی دامانـت**
**ئیـرادەم وایـە تـەرکی عالـەمی دنیـا بکـەم یـەکجار**
**ئەگـەر نەمخاتـەوە داوی هـەوای کـاکۆڵی ئەفشـانت**

"زێوەر"

"زێوەر" لێرەدا زۆر ناپەسەند و بێبەها خۆی وێنا دەکات.

**ڕیشی سپیی ڕوو زەرد و دڵ ڕەش پیری ئاخرشەڕ منم**
**لەم جیهان و لەو جیهان و بێقیمەت و بەدفەڕ منم**

"زێوەر"

"ئەدەب" دەپرسێت بۆچی جارێ لە حاڵی دڵی ماندووم ناپرسی؟ نەمزانی وەفاداریت بۆ من تا سەر نییە، من کە گیان و سەرم لەناو چوو بە خاکی ژێر پێتەوە.

**جارێ لە حاڵی خەستەدڵانت بە لوتف و ناز**
**بۆچی دەبێ نەپرسی کە چۆنن لە خاکی پات**
**جان و سەرم بە بادی فەنادا بە خاکی ڕێت**
**نەمزانی تا سەرت نییە ئەی بێبەقا وەفات**

"ئەدەب"

"ئەدەب" دەڵێت ئەو کاتە سەری من دەگاتە تۆزی بەر پێت، کە تۆزی پەیکەری من بەرز ببێت و بگات بە ئاسمانی چوارەم.

**بە خاکی پات مەگەر ئەو دەمە بگات سەری من**
**غوباری پەیکەری خاکی بگاتە چەرخی چەهار**

"ئەدەب"

"ئەدەب" دەڵێت، ئەگەر من لەسەر ئایینی گاوری بم یان لەسەر ئایینی مەسیحی یان گومڕا و بەر لەعنەتی خودا کەوتبم، وەک مۆم بۆ پەیکەری جوانت دەتوێمەوە و شوێنی من خاکی ژێر پێتە.

**ئەگەر گەبرم، ئەگەر تەرساو گەر گومڕاهـ و مەلعوونم**
**شەمەنئاسا بتی زیبا بە خاکی پات مەفتوونم**

"ئەدەب"

هەتا "ئەدەب" فەنا نەبووە و نەبووەتە تۆز و بای شەماڵ نەیبردووەتە ماڵی ئەو، هەتا ئەو کاتەی نەبووە بە تۆز، هەر لافوگەزافی لێدەدا، دەشڵێت ئیدی لەمەودوا سەری من شانازی بەوە دەکات بووەتە خاکی بەر پێی تۆ.

لە دواییدا "ئەدەب" ڕوو دەکاتە یار و پێی دەڵێت تۆ دڵگیری و دڵ دەبەیت و بە منیش دەڵێیت مەیە بۆ لام! ئاخر کوا بەدەست خۆمە نەیەم! من کە دڵم لەلات بێت،

**چۆن دەتوانم بەدوایدا نەیەم؟**
**تا بووم بە خاکی پا، نەگەیشتم مەگەر صەبا**
**بێنێتە خاکی مەقدەمەکەی تۆ غوباری من**
**تا ئەو دەمە گەزافی هونەر بوو لەمەودوا**

**خـاكی جـەنابی تـۆ و سـەری ئیفتیخـاری مـن**
**تۆ دڵ دەبەی بە غارەت و بە منیش دەڵێی مەیە**
**بـۆچی، مەگـەر بـە دەسـتی منـە ئیختیـاری مـن!**

"ئەدەب"

"ئـەدەب" دەڵێـت: ئێـوە كـە فـەرمووتان "ئـەدەب" گیـانی لـە پێنـاو گەیشتنی یار ببەخشێ، ئیتر گیانی ئازیزم بۆ چییە! ببم بە خاكی ژێر پێی چاكترە.

**ئێوە فەرمووتان ئەدەب جانێ ببەخشی بۆ ویساڵ**
**نامــەوێ جــانی عــەزیزم خــاكی پــا بــێ چــاترە**

"ئەدەب"

"ڕاجی" دەڵێت من ئەو خشڵ و بازنەم لە پێتدا ئاڵاوم تا بڕۆیت و هـەنگاو بنێیت، هـەر زرنگـەزرنگ و دەنگـەدەنگم لێوە دێت، دەبا دەستیشت بە بازن بێت و من بە خۆتەوە ببەستێتەوە.

**ئەمن تۆقم لە پێتا، تا بڕۆی هەر دەنگ وناڵەم دێ**
**ئەگەر ئازایە دەستت با ئەویش خۆی پڕ لە بازن كا**

"ڕاجی"

"سەیید تاهیر هاشمی" دەڵێت من سەگی بـەر دەرگای ماڵەكەی پێغەمبەرم (دروودی خوای لەسەر بێت)، ئیتـر لـە گـورگ و شـێری ڕۆژگار ناترسم.

**من سەگی دەرماڵی ئەو شاهەنشەهەم**
**نیمــە ترســی شــێر و گــورگی ڕۆژگــار**

"سەیید تاهیر هاشمی"

ئەگەر یارە جوانەکەی "سەیید تاهیر هاشمی" ببێتە میوانی، ئەوا بە سەد دڵەوە گیانی شیرینی خۆی دەخاتە بەر پێی یار.

**لەبەر پێت ئەخەم گیانی شیرین بە سەد دڵ**
**ئەگەر ببیە میوانم ئەی یاری جوانم**

"سەیید تاهیر هاشمی"

"سەیید تاهیر هاشمی" بە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەڵێت کە من وەک سەگ دەوەڕم و دەناڵێنم؛ لێم دڵگران مەبە، چونکە تۆ مانگ و ڕۆژی گەردوونی.

**مەبە قوربان لە دەردوداخ و ناڵە و سەگوەڕیم عاجز**
**ئەتۆ هەر مانگی ئافاقی، ئەتۆ هەر شەمسی ئەفلاکی**

"سەیید تاهیر هاشمی"

"سەیید تاهیر هاشمی" لەبەر گوناهەکانی وەک سەگێکی تینوو کەوتووە و زمانی لاڵ بووە، ئاتاجی یەک دڵۆپە ئاوی ڕەحمەتی پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر بێت).

**من سەگی تینووی بیابانی خراپی و زیللەتم**
**زوان ئەڵای دەمکەوتووی یەک جورعە ئاوم ڕەحمەتێ**

"سەیید تاهیر هاشمی"

لێرەوە "سەیید تاهیر هاشمی" دەبێتە خۆڵی ژێر پێی سەگی بەر دەرگای ماڵی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)، خەفەتبار و داماو چاوەڕێی ڕەحمەتی ئەوە.

**من خۆڵی ژێر پێی سەگی دەرماڵی سەگ بانانی تۆم**
**سەرکز و لات و حەزینم، شەهریارم ڕەحمەتێ**

"سەیید تاهیر هاشمی"

"سەیید تاهیر هاشمی" جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە یەکێکە لە موریدەکانی تەریقەتی قادری و بە سەگی بەر دەرگای شێخ عەبدولقادری گەیلانی خۆی دەناسێنێت.

**قادری ئەسلّم سەگی دەرماڵی عەبدولقادرم**
**ڕەحمەتێ شەهبازەکەی سەر دەستی قودرەت، هیممەتێ**

"سەیید تاهیر هاشمی"

"شێخ ڕەزای تاڵەبانی" کاتێک وەسفی جوانیی لەشولاری یار دەکات، وەک سەگی هاری لێ دێت و چاوەکانی ئەبڵەق دەبن.

**خڕ و مەخرووت و مودەووەر، سپی و نەرم و دونیم**
**هەروەکوو کۆمەڵە بەفرێ کە شەقی کەی بە مشار**
**کە بەدیقەت نەزەرم کردە سورێن و کەفەڵی**
**هەردوو چاوم پەڕییە تەوقی سەرم وەک سەگی هار**

"شێخ ڕەزای تاڵەبانی"

هەمدیسان "شێخ ڕەزای تاڵەبانی" لەم شیعرە فارسییەیدا خۆی بە سەگ وێنا دەکات، بەڵام ئەم جارەیان باسەکە باسی پێغەمبەرە (درووودی خوای لەسەر بێت) و وەسیەتیش دەکات ئەم شیعرە لەسەر گۆڕەکەی بنووسرێتەوە، کە دەڵێت "یا رسول الله" چی دەبێ وەک سەگی یارانی ئەشکەوت (اصحاب الکهف)، منیش بێمە ناو بەهەشت لەگەڵ یارانی تۆ، ئەو لە بەهەشت و من لە دۆزەخ، کەی ڕەوایە ئەو سەگی یارانی ئەشکەوت (اصحاب الکهف) و من سەگی یارانی تۆ.

**یا رسول الله چه باشد چون سگ أصحاب كهف**
**داخـل جنــت شــوم در زمــره أصــحاب تــو**
**او رود در جنــت، مــن در جهــنم كــی رواســت**
**او سگی اصحاب كهف، من سگ اصحاب تو!**

"شێخ ڕەزای تاڵەبانی"

ئـەم شـیعرە لەلایـەن "زێوەر"یشـەوە تـەخمیس كراوە كـە "شـێخ ڕەزای تاڵـەبانی" ژیـانی خـۆی دەبەسـتێتەوە بـە خـاكی سـلێمانی ، چونكە "كاك ئەحمەدی شێخ" لەوێ دەژی، ئیدی خۆزگە بە سەگی بەرقاپییەكەی كاك ئەحمەدی شێخ دەخوازێت.

**مەربووتــە حــەیاتم بــە ســولەیمانی و خــاكی**
**خۆزگەم بە سەگی قاپییەكەی ئەحمەدی كاكی**

شێخ ڕەزای تاڵەبانی"

"شێخ ڕەزای تاڵەبانی" لـە ستایشـی "شـێخ سـتار" دەڵێت لـەدوای هیجری تۆ من كە نەمردووم؛ پرسیاری ناوێ، چونكە وەك سـەگم، مەرگم بەئاسانی نایەت، گیانم سەختە و دڵڕەقم.

**مەپرســـە بـــۆ لـــە هجرانـــت نـــەمردم**
**كە من سەگ مەرگم و گیان سەخت و دڵڕەق**

"شێخ ڕەزای تاڵەبانی"

"بێكـەس" لـە پـرس و باسـی مـەی خواردنـەوەدا وەڵامـی ئـەو كەسانە دەداتەوە كە ئەو باسەیان لەگەڵی ورووژاند و دەڵێت:

**من عارەق ئەخۆم كە بێ كەدەر بم**
**كـەمێ لـە دنیـای دوون بێخەبـەر بـم**

**گـەلێ سـزام دی لـە ڕووی عەقلـەوە**
**بادەی مەی بخۆم، بێهۆش و کەر بم**

"بێکەس"

هەروەها لە دوو شوێنێکی تردا "بێکەس" دەڵێت:

**داخــی قــەرزاریی عــارەق خســتمیە فاکوفیکــەوە**
**گا بەدەست جەرجیس و عەبدە و گا بەدەست ئۆفیکەوە**
**هەرکـە ڕۆژ ئـاوا ئـەبێ مـن بـۆ عـارەق سـمکۆڵ ئەکـەم**
**وەک وڵاخــێ بێتــە وەختــی کــا و جــۆ و ئالیکــەوە**

"بێکەس"

**دەمێکــە یــاران مــات و خامۆشــم**
**وێنەی تلیاک کێش مەست و بێهۆشم**
**خـۆم لـە تەنقیـدات دوور خسـتۆتەوە**
**هــەواڵی دنیــام لــەبیر چۆتــەوە**
**نــازانم دنیــا ڕۆژە یــا شــەو**
**هــەموو کــارێکم خــواردن و خــەوە**
**لــە دەنگوباســی خــەڵکی بێخەبــەر**
**وەک حـەیوان ئـەژیم دوورم لـە بەشـەر**
**خــەریکی چــیم غــەیرەز خواردنــەوە**
**باســـی قومـــار و پارەبردنـــەوە**

"بێکەس"

"هێمن" کاتێک بەناو تەمەندا دەکەوێت و ڕیشی بەرەو سپیبوونی تەواو دەچێت، کرنووش بۆ جوانیی یار دەبات.

**بە ڕیشی بۆزەوە سوجدەی دەبەم بۆ جەماڵی تۆ**
**ئەدی بۆچی دەیانگوت دار کە پیر بوو تازە دانایە؟**

"هێمن"

"عاصم" خۆی بەقوربانی سەگی بەر دەرگای "غەوسی شێخ عەبدولقادری گەیلانی" دەکات و بە فریادڕەسی دەزانێت، هەروەها گیانی لەژێر پێی بەفیدا دەکات.

**خۆم بەقوربانی سەگی قاپیت ئەکەم**
**الغیاث شێخی موکەررەم الغیاث**
**جانفیدای خاکی نەعلەینی شەریف**
**الغیاث ئەی رافعی غەم الغیاث**

"عاصم"

هەر بەم نەفەس و دەربڕینەوە دیسان "عاصم" باسی حاڵی ڕووڕەشی و بێ یاوەریی خۆی دەکات لەبەرامبەر "شێخ عەبدولقادری گەیلانی" و دەڵێت ئەگەرچی لەم دۆخەدام، بەڵام ئومێدم زۆرە، چونکە سەگی بەردرەگای غەوسی گەیلانیم.

**ئەگەرچی "عاصم"ێکی ڕووسیا و بێ یار و یاوەرم**
**ئومێدم زۆرە، چونکە کەلبی قاپی غەوسی گەیلانیم**

"عاصم"

لێرەشەوە "عاصم" لە ستایش و سەنای "شێخ عەبدولقادری گەیلانی"دا خۆی دەخاتە ئاستێکی نزم و داوای ئەوە لە شێخ دەکات وەک سەگی سەر سەکۆی خۆی قبووڵی بکات و لەبەر دەرگاکەیدا شەو و ڕۆژی بۆ نییە و هەر دەناڵێنێت.

**قەبووڵم کە سەگی ئاستانەکەی تۆ بم**

**ڕوحم کە بەو گەدا یا غەوثی بەغداد**

**لەبەر قاپیت شەو و ڕۆژێ دەناڵێنم**

**ئەتۆ نەمکەی جودا یا غەوثی بەغداد**

"عاصم"

"عاصم" بێچارەیە سەگی بەر دەرگای پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر بێت)، بۆ کۆی گوناهباران هەر ئەوە ڕێنیشاندەر و ڕابەر.

**بێچارە سەگی قاپییەکەتم شافیعی مەحشەر**

**بۆ جەمعی ئەسیمان هەر ئەتۆی هادی و ڕەهبەر**

"عاصم"

لە مەیدانی مەحشەردا هەر محەمەدە (دروودی خوای لەسەر بێت) تکامان بۆ دەکات، ئیتر کە وایە سەلام باکی نییە، ئەگەر ببێتە سەگی ئەو زاتە.

**لە مەیدانی تکاکاری محەمەد مەردی میدانە**

**"سەلام"باکی چییە ئەوسا سەگی سالاری عەدنانە**

"عەبدولسەلام خۆشناو"

هەروەها لێرەشدا "عەبدولسەلام خۆشناو" بۆ پێغەمبەر(دروودی خوای لەسەر بێت) قسە دەکات و پێی دەڵێت بەبێ توێشووی سەفەری مەرگ، بەرەو ڕووت دێم و لەبەر دەرگای ڕەحمەتت وەک سەگێکی پیس و گەڕ دەلوورێنم.

**یا رسول الله ئەوا هاتم بەبێ تۆشەی سەفەر**

**لەبەر قاپیت دەلوورێنم چون سەگێکی پیس و گەڕ**

"عەبدولسەلام خۆشناو"

ئەوەتا "ویساڵی"ش ڕۆح و گیانی خۆی دەکاتە قوربانی ژێر پێی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) و وەکوو سەگێکی ونبوو لە خێڵەکەی هەر دەلوورێنێت.

**یـا ڕەسـوولەڵڵا دەخیلـت بـم بـە هاوارمـان وەرە**
**ڕۆح و جانمـان بـێ فیـدایی خـاکی ژێـری پـایی تـۆ**
**هەر دەلوورێنێ "ویساڵی" وەک سەگی ونبوو لە خێڵ**
**بـانگی کـە بـۆ خـوا کـە شـایەد بێتـەوە دەرگـای تـۆ**

"ویساڵی"

"ویساڵی" خۆی دەکاتە قوربانی سەگی دەرگای چوار خەلیفەکەی ڕاشیدین.

**بم بەقوربانی عەلی و عوسمانی "ذي النورين"ی تۆ**
**خۆم بەقوربانی سەگی دەرگاهی ئەبو بەکر و عومەر**

"ویساڵی"

"خادیم" هەم خزمەتکارە و هەم سەگێکی هـەتیو و بێ پەناگـەیـە، ئەگەر جێگەی سەگەکانی بەر دەرگای یاری دەست کەوێت، ئیدی ئەم مەقامە بە تاج و تەختی شاهان ناگۆڕێتەوە.

**ئەگەر جێگەی سەگانی دەرگەهی تۆم دەس کەوێ جەناب**
**بـە تـاج و تـەختی شـاهی نـادەم، ئـەم جێگـەی دەربـانی**
**سـەگم یـا "خـادیم"م، ئـەوا هاتوومـە بـەر دەرگـەت**
**هـەتیوێکم بـەبێ سـایە، ئـەتۆش سـایەی هـەتیوانی**

"خادیم"

"ڕەمزی مەلا مارف" لە دەربڕینێكی ساكاردا بەفیدای پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) و ئەهل و پەیڕەوانی و تەنانەت بەقوربانی سەگی بەر دەرگا و كووچەو كۆڵانەكانی دەبێت.

**فیدای خاكی بەری پێی خۆت و ئال و پەیڕەوانت بم**
**بەقوربانی سەگانی پاسی كووچە و دەرك و بانت بم**

"ڕەمزی مەلا مارف"

شەوی بەرات بەوە مەشهوورە ڕزق و ڕۆزی تیایدا دابەش و دیاری دەكرێت، لەم چوارچێوەیەدا "شاهۆ" وەک كۆیلە و توولەسەگی سەر سەكۆ موحتاجی تیكە نانێكە لە سفرەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت).

**ئەم كۆیلەیەت كە توولەسەگی ئاستانتە**
**موحتاجی لوقمەیەكە لە خوانی بەراتی تۆ**

"شاهۆ"

"شاهۆ" سەگی دەرگای پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر بێت) و بێ پەناگەیە، سا داوای لێ دەكات بەهاواریەوە بچێت.

**كەلبی دەرگای خۆتە "شاهۆ" مولتەجی مابێ بە كەس**
**سا بە هاواریۆ وەرە قوربان ئەتۆ و زاتی خوا**

"شاهۆ"

"شێخ عوسمانی سیراجەدین" وەک سەگێكی بەر دەرگا و تینووی ڕەحمەت بە شەرمەزاری و زەلیلی و دڵبرینداریيەوە داوای هیممەت و ڕەحمەت لە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەكات.

**یا رسـول الله زەلـیلم سـا بـەقوربان هیمـەتێ**
**شـەرمەزار و دڵبریـنـدارم بـەقوربان هیممـەتێ**
**تینـووی دڵ ئـاورینی قەترەیـەکی ڕەحمـەتم**
**ڕێزە خوار و کەلبی دەرگاتم بەقوربان هیممەتێ**

"شێخ عوسمانی سیراجەدین"

"مەلا ئەسعەدی مەحوی" بەدڵنیاییەوە وەسفی ڕووڕەشیی خۆی دەکـات و خـۆی وەک سـەگی یـارانی پێغەمبـەر (دروودی خـوای لەسەر بێت) و شوێنکەوتووانی ناو دەهێنێت.

**یا محەمەد من سەگی ئەصحابی تۆم و تابیعین**
**ڕووڕەش پـــیس و بـــەد و بلحـــم یـــەقین**

"مەلا ئەسعەدی مەحوی"

"محەمەد بالیسانی" باسی سەگەکەی یارانی ئەشکەوت (اصحاب الکهف) دەکات کە چۆتە ڕیزی مرۆڤ و ئەویش کە مرۆڤە، بەڵام دەبێتە سەگی یارانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت).

**تـا بـە کـەی مـن بێبەشـی نـوور و مـەعارف تـا بـە کـەی**
**گـەرچی مـن سـەگ بـم، وەلـیکن پاسـەگیریی تـۆ ئـەکا**
**سەگ بە هۆی ئەصحابی کەهفا بوو بە مەردووم توو خودا**
**مـن سـەگی ئەصـحابی تۆمـە چـۆن تکـای میـری نـەکا!**

"محەمەد بالیسانی"

"عصـام الـدین عـەودالان" وەک سـەگ لـەناو پیسـی و زبـڵ و خاشاکی بەر دەرگەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسـەر بێت) پاڵ دەکەوێت و ئەو شوێنەی بەنیعەمت دەزانێت.

**مەزبەلەی بەر دەرگەکەت وەک سەگ ئەگەر لێی کەوم**
**سـەد ئەوەنـدە کـەمتریش هێشـتا کـەماڵی نیعمەتـە**

"عصام الدين عەودالان"

"فـەتحی" کـەس وەک خـۆی نابینێـت بـەوەی کـە سـەگی سـەر سـەکۆی پێغەمبـەرە (دروودی خـوای لەسـەر بێـت)، کـە بـە هـۆی سووچ و گوناهەوە خۆی بە شایستەی جەفا دەزانێت.

**بێ شوبهەیە کە من سەگی ئاستانەکەی مستەفام**
**کە موستەحەقی خەتا بم بە خوا لایەقی جەفام**

"فەتحی"

"شـەکیب" هـەر چییـەک بێـت، بـەڵام هـەر سـەگێکی ڕووڕەش و نـەفام و سەرکەشـە، کـە وایـە پێویسـتی بـە شـەفاعەتکردنی پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر بێت) کە بە هۆی گوناهەکانیـەوە میزانی لە کاردایە و بۆی ئەژمار دەکرێت.

**هەر چی هەم، گەرچی سەگم، ڕووڕەش نەفام و سەرکەشم**
**تـۆ شـەفاعەت کـە گونـاهم هـەر خرایـە میزانـەوە**

"شەکیب"

"مـەزڵوم" لـەجیاتیی پەرسـتگا، ڕوو دەکاتـە ژوانگـەی یـار و لـەجیاتیی کڕنووشـبردن بـەرەو ڕووگـە، ڕوو دەکاتـە میحرابـی ئەبرۆی، ئیتر کاری بە تـەوافی کەعبە نابێت. ئەگەر بە یار بگات، لـەبریی بـەردەڕەشـەکەش؛ خـاڵی ڕەشـی سـەر ڕووخسـاری یـار تەماشا دەکات.

**مەعبەدخانەکـەم خەڵوەتخانـەی تـۆ**

**قیبلەگاهی سوجدەم میحرابی ئەبرۆ**

**تـەوافی کەعبـەم وەسـڵی دیـدارت**

**"حجـر الاسـود" خـاڵی ڕووخسـارت**

"مەزڵوم"

مـەزڵوم پێـی وایـە دونیـا دەزانـێ کـە لـە نەسـلی پێغەمبـەرە و ڕەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو، ئیتر خۆی وەک سەگێکی ڕووڕەش دەبینێت کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) خاوەنەکەیەتی.

**عالــەم ئــەزانێ تــۆ بــاوانمی**

**سـەگی ڕووسـیام تـۆ خـاوانمی**

**لە دنیا هەر کەس هەیبێ خاوەنێ**

**نـەجاتی ئـەدا لـە گشـت تـاوانێ**

"مەزڵوم"

"عاصی" هـەڵوەدای ئەوەیە بگات بە یار و پێیـەکانی مـاچ بکـات، ئیدی دڵ پەرێشانە بۆ گەیشتن بەم مەقامە.

**مەیلی لە قەدەم بۆسییە هەم خاکی دەری تۆ**

**بۆ وەسڵی تۆ غـەمخوار و پەرێشانە دڵـی مـن**

"عاصی"

"عاصی" بۆ شێخی بیارە دەنووسێت کە ئەگەرچی گوناهبارە، بەڵام هەر خۆی بە خاکی ژێر پێی جەنابی شێخەکەی دەزانێت.

**گەرچی من "عاصی"م و ئەمما خاکی پای دڵبەرم**

**داغی ئەم دەردە لـە دڵدا زەحمەتـە ڕەش بێتـەوە**

"عاصی"

"عاصی" لە چوارچێوەی خەوف و ڕجادا وەسفی حاڵی خۆی دەکات کە وەک سەگ دەلووریێنێت، جارێک لە ترسی ئاگری دۆزەخ و جارێکیش بۆ شەوق و نووری بەهەشت.

**خۆت دەزانی لوورەلوورمە وەک سەگی برسی خودا**
**گەهـ لە ترسی ناری دۆزەخ ، گەهـ لە شەوقی جەننەتم**

"عاصی"

بەوپەڕی زیلەتەوە، "عاصی" تکای پشت و پەناگیری و شەفاعەتکاری لە پێغەمبەر دەکات (دروودی خوای لەسەر بێت).

**سەگی دەرگاهی خۆتم من دەخیل خوێڕیم مەکە قوربان**
**سەگی دەرگاهی تۆ بێتن لە مەحشەر شوهرەت و ناوم**
**لە مەیدانی شەفاعەتدا دەلوورم وەک سەگی برسی**
**سەگی دەرگانەکەی خۆتم عیلاجێک تا نەسووتاوم**

"عاصی"

بە مەبەستی جەژنەپیرۆزەوە، "عاصی" شیعرنامەیەک بۆ "مەلا سەیید محەمەد" دەنێرێت کە لە هەولێر بووە و تیایدا دەنووسێت.

**سەر دەنێمە ژێر پێت و بەردەبازی ڕێگەتە**
**فەخرە بۆ من هەردوو چاوم منەتی تێدا نییە**

"عاصی"

"عاصی" بە گوێی جیهاندا ئاشکرای دەکات کە چ هەستێکی هەیە بۆ شێخی بیارە، لەمەوە خۆی بەراورد دەکات بە سەگەکەی یارانی ئەشکەوت (اصحاب الکهف).

**هەموو عالەم بزانن من بەشوێن چیدا کە ئاوارەم**
**ئەمن قیتمیری ئەسحابوڕەقیمی مورشیدی بیارەم**

"عاصی"

دیسان "عاصی" بەم دەربڕینەی ئاماژە بەوە دەکات وەک سەگ دەلووریێنێت، بەهیوای ئەوەی ڕەزامەندیی خودا وەدەست بخات.

**بەهیوای عەفوو و لێخۆشبوون، منی "عاصی" ئەوا هاتم**
**دەلـوورم وەک سـەگی برسـی بەچاوشـۆڕی، ئـەوا هـاتم**

"عاصی"

# بەشی حەوتەم
# مامەڵەی شاعیرانی کورد لەگەڵ "نەفس"

## نەفس چییە؟

نەفسی مرۆڤ لە یەکێک لە پێناسەکانیدا، یەکێکە لەو چوار پێکهاتە سەرەکییەی مرۆڤ کە ئەوانیش:

١. گیان

٢. دڵ

٣. عەقڵ

٤. نەفس

نەفس سەرچاوەی کۆمەڵێک غەریزەی جیاوازە، وەک: خۆراک و جنس و هێز و دەسەڵات و ئاشتیخوازی و شەڕانگێزییە.

هەروەها کۆمەڵێک تایبەتمەندیی خراپی هەیە، وەک: خۆبەگەورەزانین و چاوچنۆکی و غیرەکردن و غەیبەت و بەخیلیبردن و... هتد.

خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا (٢٩٦) جار وشەی "نەفس" و داتاشراوەکانی باس کردووە، کە بەڵگەیە لەسەر گرنگیی بابەتەکە. پەیوەستی دەکاتەوە بە چاکسازی و گەشەپێدان لە ژیانی ئاسایی مرۆڤدا، وە بەپێچەوانەشەوە ئەگەر نەفسەکە خراپەکار بوو، ئەوا دەبێتە مایەی تاوانەکان.

مامۆستا "ناسری سوبحانی" لە بارەی ڕۆح و نەفسەوە دەڵێت: ڕۆح کە هاتە ناو مرۆڤ، ئیتر پێی ناگوترێ ڕۆح، چونکە

كاریگەرییەكی خاكیش وەردەگرێت، غەرائیزەكانیش وەردەگرێت، ئیتر پێی دەگوترێت نەفس. بۆیە لە قورئان و لە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)دا، هەموو ئەو ئایەتانەی كە باسی مرۆڤ دەكەن پێش لەدایكبوون، وشەی ڕۆحیان بۆ بەكار هاتووە، ئەو ئایاتانەش كە باس لەدوای لەدایكبوونی مرۆڤ دەكەن و دوای مردنیش هەموو وشەی نەفسی بۆ بەكار هاتووە، چونكە نەفس تەنها ڕۆحی ڕووت نییە، بەڵكوو ڕۆحە لەگەڵ ئەو شتانەدا كە لە دونیادا وەریگرتووە.

## جۆرەكانی نەفس كامانەن؟

دیارە زانایان جۆرو پۆلبەندیی نەفسیان كردووە بە (٣) بەش، بەڵام زۆربەی زانایان بۆچوونیان وا بووە بەگشتی (٧) جۆر نەفس هەیە.

بۆ فراوان باسكردنی بابەتەكە، بە پێویستم زانی پۆلبەندیی ئەو زانایانە وەربگرم كە پێیان وایە جۆرەكانی نەفس بۆ (٧) ئاست دابەش دەبێت كە ئەمانەی خوارەوەن:

**١. النفس الامارة (نەفسی فەرمانكەریان فەرماندەر)**

لە خراپترینی جۆرەكانی نەفسە، نەفسێكە بەردەوام فەرمان بە خراپە دەكات و بە نەفسی شەیتانی ناو دەبرێت و ڕووی لە خراپەكاری هەمیشەییە. زۆربەی شاعیران مامەڵەیان لەگەڵ ئەم جۆرە نەفسەكردووە و لە شیعرەكانیاندا ئاماژەیان پێی داوە.

خودای موتەعال لە قورئانی پیرۆزدا لە سوورەتی "یوسف"، ئایەتی(٥٣)، ئاماژە بەم نەفسە دەكات، دەفەرموێت: ﴿ ۞ وَمَآ أُبَرِّئُ

نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٥٣﴾ ﴾واتە: "من هەرگیز پاکانەش بۆ نەفسی خۆم ناکەم، بێگومان نەفس و دەروون فەرماندەرن بە خراپە و پێداگریی لەسەر دەکەن، جگە لەو نەفسانەی کە پەروەردگارم ڕەحمیان پێ دەکات. بەڕاستی پەروەردگارم لێبوردە و دلۆڤانە."

**٢. النفس اللوامة (نەفسی لۆمەکار)**

خودای گەورە لەبەر بەرزیی پلەوپایەی نەفسی ناوبراو، سوێند بەم جۆرە نەفسە دەخوات.

بە یەکەمین پلەی ڕزگاربوون لە گوناه و هەستکردن بە شەرمەزاری لەبەرامبەر زاتی خودا بە هۆی گوناهی پێشووی و پاشگەزبوونەوەیان دادەنرێت. خودا لە قورئانی پیرۆزدا لە سوورەتی"القیامة"، ئایەتی (٢)، دەفەرموویت: ﴿وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ﴾ ، واتە: "سوێند دەخۆم بە نەفسی لۆمەکار."

**٣. النفس الملهمة (نەفسی سرووش – ئیلهاموەرگر)**

لێرەدا نەفس لەژێر هیدایەتێکی مەعنەویدایە و هێزی مەعنەوی؛ چاودێریی هەڵسوکەوتی دەکات (وەک: ڕەحمەت و خۆشویستن و عیشق و چاکەخوازی و کاری خۆبەخشی و مرۆڤدۆستی و... هتد). خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا لە سوورەتی "الشمس"، لە ئایەتی (٧) سوێند بەم نەفسە دەخوات و دەفەرموویت: [وَنَفۡسٖ وَمَا سَوَّاهَا]، واتە: "سوێند بە نەفس و بەو کەسەش وا ڕێکوپێکی کردووە."

**٤. النفس المطمئنة (نەفسی دڵنیا وئارام)**

سەنتەری شوێنی ئیمانی مرۆڤە كە لە دڵەوە جێگیر بووە، بە چەوت و لاری و برق و باقی ڕازەوەیی دونیا مەیلان ناكات و هەڵناخەڵەتێ، بەمەش دڵنیایی و ئارامی بە خاوەنەكەی دەبەخشێت. خودای موتەعال لە قورئاندا لە سوورەتی "الفجر"، لە ئایەتی (٢٧)، بەم شێوەیە ناوی ئەم جۆرە نەفسە دەبات: [يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ]، واتە: "ئەی نەفسی دڵنیا و ئارامگرتوو."

**٥. النفس الراضية (نەفسی ڕەزامەند)**

پێنجەمین پلەی نەفسە، خاوەنی نەفسێكی ڕەزامەند و سوپاسگوزار و شوكرانەبژێرە.

خودا لە قورئانی پیرۆزدا لە سوورەتی "الفجر"، ئایەتی (٢٨)، دەفەرموویێت: ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ﴿٢٨﴾ ﴾ واتە: "ئەی نەفسی ئارامگرتوو، بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگاری خۆت، بە ڕەزامەندی و پەسندكراوی لای خودا."

**٦. النفس المرضية (نەفسی پەسەندكراو)**

لەم پلەیەدا دەگەین بە نەفسی خۆشحاڵ و بەختەوەر لەم قۆناغەدا، نەک تەنها بە سەختی و ناخۆشییەكانی ژیان ڕەزامەندە، بەڵكوو خۆشحاڵیشە بە پێشهاتی هەر قەدەرێک، چونكە لە قووڵایی قەناعەتەوەیە ئەوەی لەلایەن خوداوە بێت، پێویستە مرۆڤ بەخۆشحاڵییەوە قبووڵی بكات.

خودا لە قورئانی پیرۆزدا لە سوورەتی "الفجر"، ئایەتی (٢٨) دەفەرموویێت: ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ﴿٢٨﴾ ﴾

واتـە: "ئـەی نەفسـی ئـارامگرتوو، بگـەڕێـوە بـۆ لای پـەروەردگاری خۆت بە ڕەزامەندی و پەسندکراوی لای خودا."

**٧. النفس الصافية او الزكية (نەفسی پاڵاوتە یان پاکی)**

ئـەم جـۆرە نەفسـە دوا قۆنـاغی نەفسـە و پاڵاتـە و بێخـەوش و بێگـەردە، کۆتـا هـەنگاوی بـەرەو خـوا چوونـە، یـەکلایی بۆتـەوە بـۆ بەحەق زانین و ناسینی خودای موتەعال.

خـودا لـە قورئـانی پیـرۆزدا لـە سـوورەتـی "الشـمس"، ئایـەتی(٩) دەفەرموویێت: ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ٩ ﴾ ، واتە: "بێگومـان ڕزگـار بـووە ئەو کەسەی کە نەفسی خۆی پاک کردەوە."

# نەفس لە شیعری کلاسیکی کوردیدا

لەم بەشەدا بە پێویستم زانی قسە لەسەر دیوێکی تری شیعری کلاسیکی کوردی بکەین و ئاوڕێک لەو مامەڵە دینییەی شاعیرانی کلاسیک بدەینەوە کە شاعیرانمان لەگەڵ چەمکی "نەفس" سەودایان هەبووە.

شاعیران ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بە لوغزی تایبەتەوە لە بارەی نەفسی خۆیان یان خەڵکانی تر قسەیان هەبووە و لە شیعرەکانیاندا لە چوارچێوەی تێکستی ئایینی ڕەنگی داوەتەوە، دیارە ئەمەش لە بەرەنجامی ئەو پاشخانە ئایینییەی شاعیرەکان بووە کە لە تەکیە و خانەقا و سوختەخانەکان وەریانگرتووە.

هەڵبەت نابێ ئەو ڕەهەندەش نادیدە بگرین کە لە زۆر شوێن و گەلێک دەقی ئەدەبیدا شاعیران وشەی "نەفس"یان وەک وجوودی تاکی مرۆڤ بەکار هێناوە، من ئەو نموونانە باس ناکەم، بەڵکوو کارم بە جۆرەکانی "نەفس" هەیە لەناو دەقە شیعرییەکان و نموونەی ئەو شیعرانەم مەبەستە کە وەسفی نەفس دەکات بە مانای نەفسی مرۆڤ نەک خودی مرۆڤەکە.

شەڕکردن لەگەڵ نەفس لەلای "مەحوی" ئەوەندە سەخت و دژوارە، وەک ئەوەی شەڕ لەنێوان "ڕۆستەمی زاڵ" و "ئەسفەندیار" هەڵگیرسابێت. بۆیە دەڵێت بەبێ یارمەتی و پشتیوانیی یار کە مەبەستی خودایە، مەچۆرە مەیدانی شەڕکردن لەگەڵ نەفس، چونکە ئەگەر پشتیوانی و یارمەتیی ئەو نەبێت، وەک پیاوێکی پیری ڕیشسپی بێدەسەڵات دەبێت و سەرەنجام دەدۆڕێیت.

ئەسفەندیار کوڕی گوشتاسیپ: یەکێک بووە لەو جەنگاوەرانەی "ڕۆستەمی زاڵ" لەگەڵیدا جەنگیوە و بەزاندوویەتی و دواتر کوشتوویەتی. لەم دێڕەدا دوو جار وشەی زاڵ هاتووە، زاڵی یەکەم بە واتای ڕیشسپی دێت و زاڵی دووەم بە واتای ناوی باوکی ڕۆستەمی زاڵ دێت.

**بەبێ یارێ مەچۆرە مەعرەکەی ئەسفەندیاری نەفس**
**کە لەم مەیدانەدا هەر پیرە زاڵە ڕۆستەمی بێ زاڵ**

"مەحوی"

کوشتنی نەفسی وەک ئیسفەندیار بەدەسەڵات و بەدخوو، لەسەر ڕا و تەگبیری پیری تەریقەت وەستاوە، ئەو دەتوانێت بەکوشتنی بدات یان نەیدات، وەک چۆن کوشتنی ئیسفەندیار لەسەر ڕا و تەگبیری پیرەزاڵی باوکی ڕۆستەم وەستابوو، بۆیە من داوای یارمەتیی لێ دەکەم بۆ ئەوەی بتوانم نەفسم ببەستمەوە و بیکوژم، ئیتر ئەو خۆی دەزانێت بەفریامەوە دێت یان نایەت.

**کوشتنی ئیسفەندیاری نەفسە بەستەی ڕایی پیر**
**گەر مەدەدکا، یا نەکا، لەو شاهە ئیمدادێ دەکەم**

"مەحوی"

"مەحوی" لەبەر پیری پەکی کەوتووە و لەپێ کەوتووە، کەچی نەفسی وەکوو منداڵ بەدەم ئارەزووەوە دەشنێ، لەبەر ئەو پیرییە سەری بۆ ڕاگیرناکرێت، بەڵام لە ڕووی نەفس و ئارەزووەوە وەکوو منداڵ تازە پێ دەگرێت و لە سەرەتای ژیاندایە.

**لەپێ کەوتووم و نەفسم بۆ هەوا دەشنێ وەکوو منداڵ**
**لەبەر پیری سەرم خۆی ناگرێت و تازە پێ دەگرم**

"مەحوی" نازانێت ئیدی لەوە زیاتر ئەو نەفسە چیی لێی دەوێت، کە ناپاکیی کردار و ڕەفتار و ئەفکاری ناپەسەندی هەیە.

**لە من نازانم ئیتر نەفسی بەدخوو چیی دەوێ مەحوی**
**کـە بـەدکردار و بـەدڕەفتار و بەدئـەفکار و بەدتـەورم**

"مەحوی"

"مەحوی" دەڵێت ئەو دەرد و بەڵایەی کە نەفسی سووکی خۆم بەسەریدا هێناوم، نە شەیتان و نە زەمانە و نە خزمە خراپەکانی خۆم بەسەریان نەهێناوم و پێیان نەکردم.

**نـە شـەیتان و نـە دەوران و نـە خزمـانم بـە مـن نـاکەن**
**ئەوی نەفسی خەسیسم "مەحویا" کردوویە دەربارەم**

"مەحوی"

"مەحوی" لە وەسفی نەفسی ئادەمیزاددا بە "کەر"ی بەرەڵا ناوی دەبات، کە هەردووکیان ئەگەر بەرەڵایان بکەیت، زیان دەگەیەنن. پێشینان بەڕەحمەت بن وتوویانە "خەربەستە"، بەو واتایەی "کەر"ی خۆت ببەستەوە و بێخەم بە (خەربەستە و خاوەنی خەر لە خەم ڕەستە).

**بەرەڵـداکردنی نەفسـت زەرەر خێـزە و فەسـاد ئـەنگێز**
**بەڕەحمەت بن قەدیمی ئێمە فەرموویانە: "خەربەستە"**

"مەحوی"

لێرەدا "مەحوی" دونیا بە پیرەژنێکی مەکرباز دەچووێنێت، پەنا بە خودای موتەعال دەگرێت لەدەست ئەو دونیایە و لەدەست نەفسی خۆی کە وەک جادووگەرێک وایە.

**لە مەکری ئەم عەجووزە و سیحری دێوی نەفس ئەمن مەحوی**
**پــەنا دەگــرم بــە زاتــی ئەقدەســی بێچــوونی نــادیوە**

"مەحوی"

"مەحوی" لە وەسفی نەفسی خۆیدا دەڵێت: مەگەر ڕەحمی خودا بتوانێــت نەفســم بگرێــت و دەمــی ببەســتێت کــە وەک مــاری دەمکرایــەوە وایــە، بــەدکارە و هــەر چــی بیگــەزێ؛ زیــڕەی لــێ هەڵدەستێنێت، بۆیە ئەگەر لەدەستی نەفسم ئەمین بم، ئەوا شێتییە.

**ئەمینی شێتییە مەحوی لە مەکری نەفسی ئەممارە**
**مەگەر ڕەحمی خودا دەمبەستی کا ئەم مارە ئەنگێوە**

"مەحوی"

دیســان "مــەحوی" نەفســی خــۆی بــە مــارێکی بــەدکار و بــێ چارەسەر دەچووێنێت و ناڵەناڵ و دادەدادیەتی بەدەستیەوە کە بە هۆی فڕوفێڵەکانیەوە بووە بە نێچیری ئەم نەفسە و کۆتوبەندکراوە، دواجــار دەگــەڕێتــەوە لای چارەســەری ئیلاهــی و هــەر داوا لــەو دەکات.

**ئەسیر و سەیدی قەیدی کەید و شەیدی نەفسی ئەممارەم**
**لەدەســت ئــەم مــارە بــەدچارە چییــە چــارم خــودا چــارەم**

"مەحوی"

"نــالی" لەوپــەڕی ڕۆحــی عیرفانییــەوە ئامۆژگاریمــان دەکــات کــە هەرگیز دڵنیا و بێ ترس نــەبین لــە نەفســی خۆمــان، چونکە ڕێگای خراپەمان نیشان دەدات و فــەرمان بــە خراپــە دەدات، مــاری نــەفس لەمێژە لەگەڵ مرۆڤ لە شەڕدایە و دەیەوێ مرۆڤ بەلاڕێدا بەرێ.

**موتمەئین خاتر و ئەیمەن مەبە هەرگیز لە شەڕی**
**نەفسی ئەممارە کە ئەم مارە لەگەڵ تۆ شەڕیە**

"نالی"

نەفسی بەد و حەسوود لە زاری "نالی"یەوە وەک خۆی ماوەتەوە و هەر چی خزمەتی کراوە؛ چاکتری نەکردووە، بۆیە "نالی" لەم دەربڕینەیدا دەڵێت لەبەر خراپیی خۆم، ڕووی ئاوەدانیم نییە و دوورەپەرێز لە کونجی وێرانەدا ماومەتەوە وەک کوندەپەپووی شووم بچمە هەر لایەک، دەبم بە مایەی نەگبەتی بۆ ئەو شوێنە.

**فەرقێکی نەکرد نەفسی نەفیسم بە عینایەت**
**وەحشی لە ویلایەت**
**لەم گۆشەی وێرانەیە هەر مامەوە وەک بووم**
**وەیشوومی ولاتم**

"نالی"

"نالی" لەم دێڕەدا وەک ئەدەبی داشۆرین ڕوو دەکاتە ئەو مرۆڤانەی نەفسیان کردۆتە سەنتەری کردارەکانیان و بەدوایەوە کەوتوون، باس لە مەبەستی بەڕۆژوبوونەکەیان دەکات و دەڵێت ئەگەر سکت پڕ بێت یان بەتاڵ، هەروەک شەڵتە پەیین وایە.

شەڵتە: دەفرێکی دوولاییە بۆ گواستنەوەی خۆڵ و پەیینی ئاژەڵ و شتی وا بەکار دێت.

ئیدی دەڵێت ئەو سکەت کە جارێک پڕ بێت و جارێکیش بەتاڵ، چونکە ڕۆژووگرتنەکەت لە نیازپاکییەوە نییە، ڕۆژووەکەت بۆ ئەوە ئەگری سکی خۆتی پێ هەڵگووشی و لە بەربانگیشدا دووقاتی ڕۆژ بخۆیت و بخۆیتەوە، هیوای ئەو دونیاشت بۆ ئارەزووی نەفستە کە نیازمەندی ژیانێکی خۆشتری، ئەگینا خواپەرستیی ڕاستەقینە ئەوەیە بەبێ ئامانج خوا بپەرستێت.

**وەک شەڵتە پەین گەهـ پڕ و گەهـ خاڵییە بەتنت**
**صەوم و ئەمەلت باعیصی نەفس و شەکەمەت بوو**

"نالی"

"بووم" بە واتای کوندەپەپوو دێت کە گوزارشتە بۆ شووم و وێرانبوون، گوایە کوندەپەپوو بچێتە هەر شوێنێک؛ شوومە و وێرانەی بەدواوەیە. "نالی"یش لەم دێڕە شیعرەیدا نەفسی خۆی وەک ئەو کوندەپەپووە نیشان دەدات و دەڵێت ئەی نەفسی حەز لە ئاوەدانی نەکردووی وەک کوندەپەپووی وێرانەنشین، ئەم دونیا لەچاو دونیای تر وەک کەلاوە و وێرانە وایە، دەسا تۆ تاکەی دەستبەرداری ژیانی ئەم کەلاوەیە نابیت؟ ئازایانە وەک بازی تیژفڕ بفڕە و لەگەڵ عاشقانی ئاوەدانی ڕوو بکەرە خوداپەرستی.

**ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا، هەتا کەی حیرسی وێرانە!**
**لەگەڵ ئەم عیشقبازانە بڕۆ بازانە، ئازانە!**

"نالی"

"وەفایی" باس لە فەرمانلادراویی نەفسی خۆی دەکات و دەڵێت نەفسی من بەبێ وەرگرتنی ڕەزامەندیی خودی خۆم، خەریکی ئەوەیە فەرمانی خراپە جێبەجێ دەکات و سەرکەش بووە.

ئەو نەفسە سەرکەشەی من بەبێ ڕەزامەندیی من کەوتە نافەرمانی، بۆیە دەڵێی کە وەک ئاوێنەی جیهانبینیی عیشق هەموو شتی دەبینێ، ئیدی غوبار و تۆزی گوناهی گرتووە.

**ئەو نەفسی بێ هەوایی من، سەرکەش بوو بێ ڕەزایی من**
**جامی جیهان نومایی من سەرزەدە بوو غوباری گرت**

"وەفایی"

لەم دەربڕینە عیرفانی و مەعنەوەییەدا، "وەفایی" نەفس بە سەرچاوەی مادد‌ییات و دڵ بە سەرچاوەی مەعنەوییات دەچووێنێت، بەم پێوەرە داوا دەکات ماوەیەک بەدوای هەنگاوەکانی نەفس نەکەوین و بەری لێ بگرین، بەڵکوو بەدوای دڵ بکەوین بۆ ئەوەی شەو و ڕۆژ بەباشی لێک جیا بکەینەوە و کاربۆ ئەو مەبەستە بکەین (ئەم شەو و ڕۆژە گوزارشتە لە ڕەش و سپی و چاک و خراپ).

**دەمێک نەفس بگرەوە، وەدووی دڵی خۆت کەوە**
**بزانە ڕۆژ یا شەوە، خەوت نییە هەستە کار**

"وەفایی"

"وەفایی" بەدەست نەفسیەوە دەناڵێنێت، وەک باڵندەیەکە لە گۆشەیەکی دارستانێکدا دانی بۆ دانرابێتەوە، کەچی بکەوێتە ناو

داوەوە. بەو واتایەی تووشی نەفسی شەیتانی بووە و غەریب کەوتووە و بێحەواس ماوەتەوە.

**وەک لە گۆشەی بێشەدا مەل بێتە تووشی دام و داو**
**تووشی نەفس و تووشی شەیتان بووم غەریب و بێ شوعوور**

"وەفایی"

"وەفایی" پێی وایە داواکارییەکانی دونیا تەواوبوونی بۆ نییە و لەبەر سەرگەرمی و ڕابواردنی دونیاوە یادی خودا ناکات، بۆیە "وەفایی" بەم شێوەیە لۆمەی نەفسی خۆی دەکات.

**لەحزەیەک یادی خودا ناکا لەبەر عەیشی جیهان**
**نەفسی کافر وا دەزانێ قەت جیهان ڕانابرێ**

"وەفایی"

"سالم" دەڵێت ئەگەر داماوی دەستی نەفسێکی کە فەرمانت پێ دەکات بۆ خراپەکاری وەک ئەوەی تێکشاو بیت لە ترسی مار، بۆیە بۆ بەهاناوەچوون؛ پەنا بۆ ئیمامی عەلی کوڕی ئەبی تاڵیب ببە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە ئەو لە ناخەوە خوداپەرستە و بۆ دوارۆژ لە کۆششدایە، پەنا بۆ "بو عەلی سینا" مەبە کە حەکیم و زانای دونیاییە و بۆ دونیا لە کۆششدایە (بو عەلی سینا بە شێخ رەئیس ناسراو بووە. زانا و فەیلەسووف و پزیشک و ئەستێرەناس و بیرکاریزانی گەورەی ئێرانییە. لە ناوچەی بوخارا لەدایک بووە و لە هەمەدان کۆچی دوایی کردووە).

**زەلیلی نەفسی ئەمماره شکستی بیمی ئەم مارە**
**پەناهت بۆ "عەلی" بێنە مەڕۆ بۆ "بووعەلی سینا"**

"سالم"

"سالم" دێوی نەفسی بە نەساغ وەسف دەکات کە ئەشکەوتی جەستەی پڕ کردۆتەوە، بۆ لەناوچوونی ئەو دێوە، داوای هێزێکی زۆری وەک هێزی ڕۆستەمی زاڵ دەکات.

**دێوی نا"سالم"ی نەفسم پڕی غاری بەدەنە**
**قوەتێکی بەقەدەر ڕۆستەمی زاڵم طەڵەبە**

"سالم"

ئەی دۆست خۆت لە هەموو شتێک دابماڵە و وەرە، ئەسپی سەرکێشی نەفسی خۆت بەجێ بهێڵە، هەموو پێچێکی نەفس لە ڕێی عیشقدا سەد شەیتانی تێدا بووە بە کۆسپ و ڕێت پێ دەگرن، یا جڵەوی ئەسپی نەفست دەگرن.

**موجەڕڕەد بە ڕەفیق بێ تەوسەنی نەفست بەجێ بێڵە**
**لە ڕێی عیشقا هەموو پێچێکی سەد شەیطان جڵەوگیرە**

"سالم"

ئەی دڵ، بە قسەی تۆ، نەفسی فەرماندەرم فەرمانم پێ دەدات و بەرەو ئەگریجە ڕامدەکێشێ، من لە کاتێکدا دۆڕاوێکی لارەملی فەرمانپێدراوم بە ئەگریجەت کە وەک مارە، مەمترسێنە.

**بە قەولت نەفسی ئەممارەم، دڵا! بۆ طوڕڕە دەمکێشێ**
**کە من مەغلووبی ئەممارەم، بە ئەم مارەم مەترسێنە**

"سالم"

ئەی نەفسی ناپاک و چەپەڵ، تۆ مایەی ئاژاوە و ئاشووبی، تۆ بۆ خەلیفەی پیرۆز کە (دڵ)ە، بووی بە "مەروانی کوڕی حەکەم" کە بووە بە مایەی نەهامەتی بۆ خەلیفە ئیمامی عوسمان (ڕەزای خوای

لێ بێت)، تۆیش بووی بە هۆی نائارامیی دڵ و نێوانی دڵ و یارت تێکداوە.

**مایەی فیتنەیی، ئەی نەفسی پەلید**
**بۆ خەلیفەی دڵی من "مەڕوان"ی**

"سالم"

"سالم" لەم دێڕەدا مەبەستی ماددیی نییە، بەڵکوو دیوە مەعنەوی و عیرفانییەکەی دەهێنێتە بەر باس و داخی ئەوەی لە دڵ دەرناچێت کە هەموو پارەیەکی دینداریی خۆی بۆ کاری دونیایی بەهەدەر داوە، قازانجی دونیایشی ناوەتە چنگی نەفسی سەرکێش و خۆپەرست.

**درێغا نەقدی دینم کردە صەرفی کاری دونیایی**
**صەڵاحی دونیەویشم دایە دەستی نەفس و خودڕایی**

"سالم"

"مەولەوی" داوا لە خودای گەورە دەکات لە دەریای کەرەمی خۆی بێبەشی نەکات و لە شەڕی نەفس لای بدات، تا بە فەزڵی خۆی لەدەست نەفسی؛ ئارامی و حەسانەوەی پێ ببەخشێت.

**جە بەحر کەرەم بێبەشم مەکەر**
**شەڕ نەفسانی جە ڕاگەم لابەر**
**تا بە "فضل"ی وێت بوانیمەوە**
**جە دەس هەوای نەفس بسانیمەوە**

"مەولەوی"

"حەریق" لەبەر غەیری خودا لە خودا دەترسێت لەم دەربڕینەدا، نەترسانیشی بەدرۆیە وەکوو ترس و تکایە. نەفسی بەدکاریشی دەڵێت خودا بەبەزەییە، جا نازانێت نە لەبەر ئەمنیەتی خودایە، یان لەبەر بێهیوایی یان لە نەفسەوەیە.

**خەوفم لە خودا چونکە لەبەر غەیری خودایە**
**ئەمنم بە درۆ سووڕەتی وەک خەوف و ڕەجایە**
**پاڵی ڕەحمەتی داوەتەوە نەفسی خەسیسم**
**یا ئەمنی غەنا، یا ئەسەری یەئس و هەوایە**

"حەریق"

"حەریق" دەڵێت تەمەنێک کە بناغەی ویستەکانی نەفسبازی بێت، بۆ ئەوە نابێت ببێتە خاوەنی خۆی و غەم و خەفەت.

**عومرێ کە ئەساسی هەوەسی بازیی نەفس بێ**
**قابیل نییە بۆ خێوی وی شادی و ئەلەم و غەم**

"حەریق"

"حەریق" سەرمایەی پەرستش و چاکەکاریی بای ئەوە نییە گەرموگوڕیی پێ بدات و دڵخۆشی بکات، چونکە پەیوەندە بە خراپیی نەفسەوە کە بە دێو ناوی دەهێنێت و دڵیشی کە سەرچاوەی مەعنەویەت و عیرفانە وەک باڵندەیەکی بێ پەڕ و باڵی لێ هاتووە بە دەستیەوە.

**عەجەب بۆت بۆتە زستان زەمهەریری باری عیسیانت**
**کە شک نابەی چ سەرمایە، دەڵێی وەی وەی چ سەرمایە**

**بە دەستی دێوی نەفسم دڵ وەکوو مورغی بێ پەڕ، وایە**
**وەکوو پەروانە بۆ شەمعی تەلەسمی ئەو، بێ پەروایە**

"حەریق"

"حەریق" بەدەست شەڕی نەفسیەوە داد و فریادیەتی و خۆی بە مەزڵوم دەزانێت و شوناسی لەژێر مەترسییەکانی شەیتاندایە، دەڵێت:

**ئەی پادشەهی موڵکی ویلایەت بە عەدالەت**
**مەزڵومی شەڕی نەفسم و هاتوومەتە شکایەت**
**کەوتوومەتە ژێر دەستی شەیاتینی نفووسم**
**دەستێ بدەرە دەستی شکەستم بە عینایەت**

"حەریق"

"پاکی" پێی وایە وەک چۆن ئاش کاری هاڕینی گەنم و جۆ و دانەوێڵەیە وماندوو نابێت و هەر داوای دانەوێڵە دەکات، ئیدی نەفسی ئەمیش وەک ئەو ئاشە وەهایە لە داواکردن.

**نەفسەکەم وەک ئاشی ئاگر باراشی هیچ بەر ناگرێ**
**هەر چەندە دانی بدەیتێ هەر دەکا فەریاد و زار**

"پاکی"

"ئەورەحمان بەگی بابان" لەو شیعرەیدا زۆر بەخراپی باسی ئافرەتان دەکات و هەر چی ئاکار و کرداری خراپ هەیە دەیداتە پاڵیان، ئینجا هەر لەو چوارچێوەیەشدا باسی نەفسی ئافرەتان دەکات و تەڕ و وشک بەیەکەوە دەسووتێنێت، بە خاوەن نەفسی ئەممارە وەسفیان دەکات.

**فیکری دووربینی نییە، ئیشی هەموو واتای دەمە**
**نەفسی ئەممارەی بجووڵێ هەر لە عالەم بێغەمە**

"ئەورەحمان بەگی بابان"

"ئەورەحمان بەگی بابان" ستایشی "ڕۆژنامەی هیوا" دەکات و ئەم شیعرەیان پێشکەش دەکات کە تیایدا داوای ئەوە دەکات ڕۆژنامەکە بەدوای هەوا و نەفسەوە نەکەوێت، بەڵکوو ڕێگەی حەقیقەت و چاکەخوازی ون نەکەن.

**داوا ئەکەم هیوای وەتەنم بێهیوا نەبێ**
**وەک وێنەی بە گێژوخولێ بەر هەوا نەبێ**
**ئەم لاپەڕە کە ئاوێنەی فیکری کۆمەڵە**
**سۆزی دەروون و دڵ بێ لە نەفس و هەوا نەبێ**

"ئەورەحمان بەگی بابان"

"فەنایی" لەم فەلسەفەی ژیان و مەرگەدا دەڵێت ژیان و مەرگ وەکوو یەک وان، ژیانت جۆرە مردنێکە، مردنیشت جۆرە ژیانێکە، چارەی ئەم دۆخە ناجێگیرە تەنها بە عاشقبوونە. ئەگەر وا نەبێت، لەم سێیانە؛ یەکێکیان تۆ ڕیسوا دەکەن (١. نەفس، ٢. شەیتان، ٣. ڕەفیقی ناپەسەند).

**ئەگەرچی بوونیشت نەبوونە وەک نەبوونت بوونە بۆت**
**تازە چارت ناکرێ هەر عەشقە حاڵت چا ئەکا**
**نەفسە یا شەیتانە مەنیع یا ڕەفیقی ناپەسەند**
**لێرە یا لەولا بزانە تۆ بە تۆ ڕیسوا ئەکا**

"فەنایی"

"ناری" دەڵێت کە تۆ دەزانی ناتوانیت لە مەرگ هەڵێی، ئیدی بەسە، دەست لەم هەموو شتە پڕوپووچە هەڵگرە کە سوودی بۆ قیامەتت نییە.

ئەی نەفس، دە تۆش ئەوەندە ناز مەکە وەک شتی بەنرخ، نەکا ئیبلیس بێت و دەستت بگرێت و خراپەکاریت فێر بکات.

**بۆ خۆت کە دەزانی لە مەرگ نیتە هەڵاتن**
**پەس ئەم هەموو تەفرە و شتە بێجایە هەتا کەی؟**
**نازیش مەکە ئەی نەفسی فرۆمایە بە تەدریس**
**نەک دەستی ئەتۆ بێ بگرێ خایەیی ئیبلیس**

"ناری"

"صابری" بە پێویستی دەزانێت کە لەمەودوا ئەو تەمەنەی لەدەستی ڕۆیشتووە، بە چاکەکردن بیگێڕێتەوە و قەرەبووی بکاتەوە، بەمەش پێویستی بەوە هەیە ڕوو لە "مەولا" بکات. کوشتنی نەفسی خۆی بە جیهادی گەورە دەزانێت، ئیدی بەمەش تەقوای وەک شێر بەهێز دەبێت و نەفسیشی وەک ڕێویی بەزیوی لێ دێت، ئەمەیە ڕۆژی جیهاد و تێکۆشان لە پێناو ڕێگای خوداپەرستی.

**با لەمەولا عومری ڕابردوو قەزا گێڕینەوە**
**ڕوو لە مەولا کەین و هەم بگرینەوە ڕێگەی ڕەشاد**
**سەر بڕینی نەفسی ئەممارە جیهادی ئەکبەرە**
**شێرە تەقوا نەفسە ڕێوی صابری ڕۆژی جیهاد**

"صابری"

"صابری" ئاخ و زاریەتی لەدەست نەفسی شوێنکەوتووی خراپەکاری، بۆیە شیاوی ئاگری دۆزەخە کە هەمیشە خواردن و خواردنەوە پیشەیەتی و فەرمانی پێ دەکات نان و خۆراکی بۆ پەیدا بکات.

**ئاخ لە دەس نەفسی لە ئێمە تابیعی دێوی ڕەجیمە**
**لائیقی ناری جەحیمە تابیعی فیسق و فەساد**
**نەفسی ئەممارە هەمیشە خواردنی لێ بۆتە پیشە**
**پێم ئەڵێ قەت دامەنیشە بۆم پەیا کە نان و زاد**

"صابری"

"سەیید کامیلی ئیمامی" حاڵی خراپ گوزەرانی خۆی بەیان دەکات، کە بە هۆی نەفسیەوە پیس بووە و ڕووڕەشی دەرگانەی باری تەعالا بووە.

**ڕووڕەشی دەرگای خوداوەندم لەبەر نەفسی خەبیس**
**سەیری ئاماڵی گڵاوم کەن دەگەڵ ئاکاری پیس**

"سەیید کامیلی ئیمامی"

کوردی یان "هیجری" دەڵێت:

کەشتیوانی عاشق ئەگەر عەشقەکەی خراپ بێت، ئەو مارەی نەفسە کەشتییەکەی کون دەکات و عاشق دەرباز نابێت.کەسێک پێی ناگوترێ عاشق و ناکەوێتە بازنەی عیشقەوە، هەتا وەکوو "هیجری" تووشی دووری و خەفەت نەبێت .

**ناخودای عاشق سەفینەی عەشقەکەی"ئەممارە"بێ**
**"مار"ە کەشتی کون ئەکا تا غەرقی کا و ڕزگار نەبێ**

**ناخرێتــە ڕێــزی عوشــاقان و خانــەی عەشــقەوە**
**تاوەکوو "هیجری" بە هیجران و خەفەت دووچار نەبێ**

"کوردی"

"تـاهیر بـەگی جـاف" دەڵێـت ئـەی نەفسـی یـاخی، ئەگـەر چەنـد ڕۆژێک دونیا دەستەمۆی تۆ بێت، تۆش دڵی خۆش بکـەیت، ئـەوا بەڕاستی جێی شەرمە بۆت.

**نەفسی سەرکەش چەند ڕۆژێ گەر جیهانت ڕام ببێ**
**دڵ ئەگەر خۆشکەی بە خۆت، بێعارییە بەم "عاریە"**

"تاهیر بەگی جاف"

"تاهیر بەگی جاف" لێرەدا ڕوو دەکاتە عەقڵ و لێی دێتـە پرسـیار و پێـی دەڵێـت تـا کـەی دەبێـت تـۆ دەستەوەسـتان دامـاو بیـت و بەستراوی نەفسی فەرماندەر بیت کـە خـەیاڵاتیشـت کەمبایـەخ بێت. دەی کە وایە حیسابێکی حاڵی خۆت بکە، دواجار هـەر دەبێ بمـری و پێویستیت بە قوماشی کفن هەیە.

**ئەلا ئەی ئەقڵی کۆتایین هەتا کەی مات و داماوی**
**بە قەیدی نەفسی ئەممارە سەراسەر بۆچی بەسراوی**
**خەیاڵی هیچوپووچت وایە دەوڵەت هەم عەنانت بێ**
**حیسـابێکە، کـە موحتـاجی نەسیبی دوو گـەزە جـاوی**

"تاهیر بەگی جاف"

"تاهیر بەگی جاف" دەکەوێتە لۆمەکردنی خۆی کە گیرۆدەی نەفسـی ئەممارەی بووە، واتە لە نەفسی لەوامەوە دەچێتە نەفسـی ئـەممارە. دەڵێت من بارەبەری ئەو نەفسە کافر و خراپەی خۆمم بێ توێشوو و خواردنی ڕێگەی قیامەت، هەر خۆمم، کە وا بوو بێچارە خۆمم.

**بوردە باری دەستی نەفسی کافری ئەممارە خۆم**
**بێ زەخیرە و زادی ڕێگەی ئاخیرەت بێچارە خۆم**

"تاهیر بەگی جاف"

"نامی" ڕوو لە پێغەمبەر دەکات (درووودی خوای لەسەر بێت)، دەڵێت من سواری ئەو نەفسە سەرکێشەی خۆمم، پەنام بە پشتیوانیی تۆیە ئەی شۆڕەسوارەکەم.

**سواری ناباری نەفسی سەرکێشم**
**پەنا بە سوارەی خۆش عەنانی تۆم**

"نامی"

موخلیس دەڵێت گشت گەردیلەکانی بەدەنم نغرۆی شەپۆلەکانی دەریای گوناهـ بوون، بە هۆکاری نەفسی فەرماندەری خراپەکارییەوە حاڵی پەرێشان بووە.

**هەموو زەڕڕاتی جیسمم غەرقی لوجەی بەحری عیصیانە**
**لەدەست ئەم نەفسە ئەممارە عەجەب حاڵم پەرێشانە**

"موخلیس"

"شێخ نووری شێخ بابا عەلی قەرەداغی" لەم شیعرەیدا لۆمەی نەفسی خۆی دەکات بەوەی تا کەی خزمەتکاری ماددیاتە و دونیاپەرستی دەکات، نەفسی بە نەفسێکی بەد ناو دەبات، هەروەها دان بەوەدا دەنێت نەفسی هێندە ئارەزوومەندی گوناهـ بووە، بە جۆرێکی لێ هاتووە هەر کەس ئامۆژگاریی ڕێگەی ڕاستی بکات؛ تۆمەتباری دەکات و قەرزاری دەکاتەوە.

**ئەی نەفسی بەد تا بە کەی دونیاپەرستی ئەکەی**
**غـولاّمی دینــارت و کەمەربەســتەی درهــەمی**
**نەفسم ئەوەندە ئارەزوو و مەیلی گوناهی هەیە**
**هـەر کـەس نەسیحەتم کا ئەیخـەمـە موتەهـەمی**

"شێخ نووری شێخ بابا عەلی قەرەداغی"

"فـەوزی" دەڵێـت بـە هـۆی نەشـئەی عەشـقی ئـەو دونیـا دڵپـاک و بێگـەردە، سـینەم لـە ژەنگـی تـاوان شـۆراوەتەوە و پـڕ بـووە لـە تەجـەلای خـودایی، لـە سـاختەکاریی نـەفس و فرتـوفێڵی شـەیتـان ڕزگارم بوو، چ سەیرە پلەی عیشق ئەم بەڵایەی نەفسم لێ دوور دەخاتەوە!

**لــە نەشــئەی فــەیزی عیشــقی عالــەم دڵ موصــەففایە**
**لــە ژەنگــی مەعصــیەت شــۆراوە ســینەم پــڕ تەجەللایــە**
**لە دەس تەزویری نەفس و مەکری شەیتانی لەعین دەرچووم**
**عەجــەب باڵایــە ڕوتبــەی عیشــقم و نەفســم تەوەللایــە**

"فەوزی"

هـەر چەنـد "لـوتفی" هـەوڵ لەگـەڵ نەفسـی بـەد دەدات بێئاکامـە، چونکە لەدەستی دەرچووە و حـەیران ماوەتـەوە، نازانێ چـی لـەو نەفسە بکات، مەگەر هەر خودا ڕەحم بە حاڵی بکات.

**من ئەوەندە هەوڵ ئەدەم نەفسم لە دەستم دەرچووە**
**چـی لـە مـەیلی نەفسـی بـەد کـەم جـانی جانـانم وەرە**
**گـەر لەمـەولا خـوا بـەخۆی ڕەحمـێ بکاتـە حـاڵی مـن**
**نەفســی بـــەدکارم ئـــەکوژرێ دڵ بـــەقوربانم وەرە**

**"لوتفی"بەس شیوەن بکە بۆت ناگیرێ نەفسی بەدت**
**شـاهی"لولاک" بێتـە ئیمـداد نـووری ئیمـانم وەرە**

"لوتفی"

"شاهۆ" نەفس و شەیتان هاوتەریب وەسف دەکات کە بەسەریدا زاڵـن و وەکـوو شـێر و ئـەژدەها (ئـەژدیها) دەوریـان داوە و وابەستەی خۆیانیان کردووە.

**نەفس و شەیتانی لەعینم وا بەسەرما زاڵمن**
**دەوریان داوم بە دایم میسلی شێر و ئەژدەها**

"شاهۆ"

"پیرەمێرد" شـەیتـانی بـەر نەفرینکـەوتووی خوداوەنـد و نەفسـی فەرماندەر وەک یەک ناو دەبات، کە بەسەر وجوودیەوە وەک ئاغا و سەرکار ڕەفتار دەکەن.

**شەیتانی لەعین، نەفسی ئەممارە**
**لەسـەر ئـەعزاما ئاغـا و سـەرکارە**

"پیرەمێرد"

ڕۆحـی "پیرەمێـرد" بەنـدە بـە ڕەزامەنـدیی خـوداوە کـە نەفسـی ئارەزووی حۆرییەکانی بەهەشت دەکات، بـەڵام کاتێک لـەو دونیـادا خوا ببینێت، ئیدی کاری نامێنێت بە حۆری و بـەدوای نەفسـیەوە ناکەوێت.

**ڕۆحـم بــە ڕەزای تــۆوە سروشــتە**
**ئـارەزووی نەفسـم حـۆری بەهەشـتە**

**لیقای تۆ کە خۆی بە ڕۆح ئەنوێنێ**
**ئیتر ئارەزووی نەفسم نامێنێ**

"پیرەمێرد"

هەروەها پێی وایە ئەو کەسانەی بە حیکمەت و داناییەوە بژین، گیانیان دەبەخشن لە ڕێگای حەقدا و باکیان نییە بە ئارەزووەکانی نەفسی خۆیان، تەنها بەخاتری ئەوەی ڕەزامەندیی خودایان بۆ تاوێک دەست بکەوێت.

**پەروەردگارا ئەوانەی دانان**
**جانیان ئەبەخشن بۆ مەیلی جانان**
**ئارەزووی نەفسی خۆیانیان ناوێ**
**تا مەیلی تۆیان دەست کەوێ تاوێ**

"پیرەمێرد"

بەڵام لەگەڵ ئەو جیهانە عیرفانییەی کە "پیرەمێرد" هەیەتی، ترسی لەوە هەیە بە هۆی زۆریی پەرستشەوە نەفسی بەرەو غرووری ببیات. لێرەوە "پیرەمێرد" دەردەکەوێت کە لە خواپەرستیدا بەدوای چەندییەوە نییە، بەڵکوو بەدوای چۆنیەتییەوەیە.

**خودایە نامەوێ تاعەتم زۆر بێ**
**نەوەکا نەفسم بەوە غروور بێ**

"پیرەمێرد"

"مەلا محەمەدی ڕەبیعی" لەبەردەم زاتی پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێت) تکاکارە و داد و فریادیەتی کە ژێردەستەی شەیتان و نەفسی مەکربازیەتی، بەم هۆیەوە نغرۆی دەریای گوناھ بووە.

**دەخیلەک یا رسول الله ئەسیری داوی شەیتانم**
**زەلیلی نەفسی مەکار و غەریقی بەحری عیسیانم**

"مەلا محەمەدی ڕەبیعی"

نەفسی بەد دڵی "پاکی" بۆ خۆی بردووە و بێچارە ماوەتەوە، بۆیە ژاکاو دیارە و ڕێگای هەڵاتن لەدەست ئەم نەفسە نادۆزێتەوە. وە ئەگەر بەم جۆرە بەردەوام بێت لەسەر پەیڕەوی نەفسی پیس، ئیدی گومانی تێدا نییە جێگەت جەهەنەم دەبێت.

**دڵی کردوومە کەمەندکێش نەفسی بەدڕەگ چاوەکەم**
**چاری بێچارە دڵی پەژموردە پێی ناکرێ فیرار**
**"پاکی" بەم جۆرە بکەی تۆ پەیڕەوی نەفسی خەبیس**
**جێگەتە بێ شک جەهەننەم "دارک دار البوار"**

"پاکی"

"حەمدی" دەڵێت بۆچی پێتان وایە کوفرم کردووە ئەگەر بڵێم ژینی ئەم سەر زەوییە بەهەشتێکە بۆخۆی کاتێک هەر چی دڵ مەیلی بۆی بچێت و نەفس داوای بکات، ئامادەیە.
"حەمدی" دەیەوێت بڵێت لەم سەر زەوییە ئەگەر بەدوای نەفس و دڵ بکەوی، دنیا دەبێتە بەهەشت.

**هەر چی دڵ مەیلی دەکا هەر چی نەفس لازمیەتی**
**حازرە، بۆچی ئیتر کوفرە بڵێم ڕیزوانە ئەرز!**

"حەمدی"

"زێوەر" دەڵێت هۆ ئەی نەفسە پووچ و بێکەڵکەکەم، بزانە شەیتان جگە لە زیانگەیاندن، هیچی دی ناکات. شەیتان بەدڕەوشتیی لە سروشتیدایە، زەحمەتە لا بچێ.

**بە حوکمی حەق ڕەزا نابی ئەبەد مەترووود و مەحکوومی**
**ئەلا ئەی نەفسی دوون، شەیتان ئەبێ غەیری زیان چ بکا**
**کە بەدخولقی تەبیعەت بێ بە میسقەل زەحمەتە لا چێ**
**لە دەست بوجەهل و ئەمسالی ڕەسوولی ئینس و جان چ بکا**

"زێوەر"

"زێوەر" ڕوو لە نەفسی خۆی دەکات و بە نەفسی سووک ناوی دەبات، هاوکات ئەو نەفسە سووکەش وەک فیرعەونی خۆبەگەورەزانین دەبینێت و لێی دەپرسێت ئەم هەموو سەرچڵییەت تا کەی بەردەوام دەبێت!

**ئەی نەفسی دەنی هەروەکوو فیرعەونی لە کیبرا**
**ئەم حەشمەت و مەغروورییە تا کەی لە هەموو لا**

"زێوەر"

"ئەدەب" دەکەوێتە قسەکردن لەگەڵ نەفسی خۆی و لێی دەپرسێت: هەتا کەی جەفای دیداری گوڵان و بە لێوی یار دەگەی؟ هەتا کەی بەدوای وەسوەسەی نەفسی بەدبەخت دەکەویت؟

**تا کەی بە جەفای وەسڵی گوڵان و لە بێ دڵدار**
**تا کەی بەدوای وەسوەسەی نەفسی بەد ئەختەر**

"ئەدەب"

"ئەدەب" مەرج دەكات بەوەی قوتابخانەی عیشقی دەوێت نەک بەدوای هەوا و نەفسیەوە بكەوێت، وەک بێزاری دەربڕینێک لە فەقێیان تكا و ئەرجوو دەكات ئەم پەڕاوانە دوور بخەنەوە.

**شەرتی "ئەدەب" مەكتەبی عیشق و نە هەوای نەفس**
**تــوو خـودا بـەرە دەر لێـرە، فـەقێ: دەفتـەر و قـەرتاس**

"ئەدەب"

"حەیدەری" بە زمانی تكاكارانەی خۆیەوە دەخیلی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەبێت و داوای شەفاعەتی لێ دەكات، چونكە بووە بە ئەسیری نەفس و شەیتان و نغرۆی دەریای گوناهـ بووە.

**غـەریقی بـەحری عوصیانم دەخالـەت یا رسـول اللـه**
**ئەسیری نەفس و شەیتانم شەفاعەت یا رسول الله**

"حەیدەری"

"نەدیم" بەئاگایە بۆ باسوخواسەكانی ژین و بێخەبەرە لە پەرستش، چونكە دیل و ژێردەستەی نەفس و بەندەی دینداری ئارەزووەكانیەتی.

**بێداری مەسئەلەی ژین نوستووی تاعەت و دینم**
**دیلـی نەفسی نـەفیس و كۆیلـەی ئارەزووەكـانم**

"نەدیم"

لەلای هەیبەت ئەوە نەفسە بووە بە ڕاوچی بۆ مەلی دڵ و بە مەكر و نازی خۆیەوە خستوویەتیە تەڵە و دانوداوی بۆ داناوەتەوە و پێگیری كردووە.

**کەنەفسە بۆ شیکاری تائێری دڵ**
**لە پێی دانانی مەکری دان و داوە**

"هەیبەت"

"سەیید تاهیر هاشمی" شوێنکەوتەی نەفسی بەدفەڕە لە تاعەت بێبەشە، بۆیە پەنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەبات.

**من موتیعی نەفسی بەدفەڕماو لە تاعەت بێ نەسیب**
**ئەی شەهنشای بەرحەقی شاهانی ڕۆحانی مەدەد**

"سەیید تاهیر هاشمی"

"سەیید تاهیر هاشمی" بەدەست نەفسی سەرکەشیەوە دەردەدارە و بەئومێدەوە ڕوو دەکاتە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت)، بەڵکوو وەک پزیشکێک چارەسەری ئەو گرفتارییەی بکات و نەفسی پاک بکاتەوە.

**ئەی ئومێدی شەرمەسارانی سەفی ڕۆژی حیساب**
**ئەی تەبیبی نەفسی سەرکەش دەردەدارم ڕەحمەتێ**

"سەیید تاهیر هاشمی"

دیسان لێرەشەوە "سەیید تاهیر هاشمی" لە دەرگای هیمەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) دەدات کە چارەیەک بۆ حاڵی بدۆزێتەوە و نەجاتی بدات لەدەست کۆت و زنجیری هەوا و نەفسی شوومی.

**من ئەسیری نەفسی شووم و گیری زنجیری هەوام**
**چاوەنواڕی هیممەتە مەردانەکەی تۆم هیممەتێ**

"سەیید تاهیر هاشمی"

شـەو و ڕۆژ وەكـوو شـێتی بیابانـەكان "شلماشـی" دەناڵێنێـت بەدەست نەفسێک كە فەرماندەری خراپەكارییە و هـەموو تەمـەنی بەبادا دایە.

**شەو و ڕۆژێ دەناڵێنم وەكوو مەجنوون لە صەحرادا**
**ئیطاعەی نەفسی ئەممارە هەموو عومری بەبا دادا**

"شلماشی"

"عاصم" بۆ دەمبەستەی نەفسی فەرماندەری خۆی، داوای لوتف و هیممەتی "شێخ عەبدولقادری گەیلانی" دەكات.

**ئەگەر لوتفت هەبێ جارێ نیگاهێ گەر بكەی بۆ من**
**لغاوی نەفسی ئەممارەم بكە ئەی یارەكەی بەغداد**
**خەلاسـم كـەن لـەنێو زنجیـری نەفسـە**
**ئیمـامی ڕەهونمـا یـا غـەوثی بەغـداد**

"عاصم"

"عەبدولسـەلام خۆشـناو" لـە دەسـتی نەفسـی فەرمانـدەری خراپەكارییەوە دەناڵێنێت و دڵیشی ڕووخاو و وێرانـەیە، دەروونـی تاریكە و بەدوای ڕێگەچارەی دەربازبوون لە تاوانەكانیەوەیە.

**بە دەستی نەفسی ئەممارە دڵم وەک خانی وێرانە**
**دەروونم تاریكە چی بكەم لەدەست كرداری تاوانە!**

"عەبدولسەلام خۆشناو"

"سەلام" لە شیعری "کۆتر و ڕاوکەر"دا ئاماژە بە نەفسی مرۆڤ دەکات کاتێک زاڵ دەبێت بەسەر کردارەکانی مرۆڤدا، ئیدی عەقڵیش لەو نێوەندەدا پەکی دەکەوێت.

**ڕاوکەر وەکوو مەل بۆ کۆتر فڕی**
**کێردی هەڵکێشا و زوو سەری بی**
**زانایەک ئەڵێ من لەلام وایە**
**وەختی تۆ مەنطق وا لە دەستا**
**عەقڵت زاڵ ببێ بەسەر نەفستا**

"سەلام"

"نەبەز پێنجوێنی" دەڵێت با بەدەنیشم بریندار بێت، بەڵام بۆ ئەوەی لەدەست نەفسی فەرماندەری خراپەکاریمەوە ڕزگاریم بێت، هەنگاو بەرەو لای خودا هەڵدەگرم و بەو ئومێدەیە ئیدی ژینی لەو شەوگارییەوە ببێتە ڕۆژی ڕووناک.

**لە دەستی نەفسی ئەمماره**
**بەیانی ژینم شەوگاره**
**ئەگەرچی جەستە بیماره**
**بەرەو لای تۆیە هەنگاوم**

"نەبەز پێنجوێنی"

"ماتی" داوای ڕەحمەتی ئیلاهی دەکات کە بە هۆی گوناهەکانیەوە لە ڕووکەشدا سیمای ڕۆحانی دەردەکەوێت و لە ناوەوەشدا نەفسێکی خراپ و ناپاکی هەیە.

**ئیلاهی مەرحەمەت فەرموو لە دەرهەق زوڵم و عیصیانی**
**بە زاهیر شکلی ڕۆحانی بە باتین نەفس و نەفسانی**

"ماتی"

"سەباح بەرزنجی" لە شیعرێکی عیرفانیدا پەرستنی خودای گەورە بە فەلسەفەی ژیان و تەمەنی مرۆڤ دەزانێت، بۆیە داوا دەکات هەتا ماوین و نەمردووین؛ وریا و هۆشیار بین و بە تەزکیەی نەفسەوە خەریک بین و لەگەڵ تەقوادا کۆک بین.

**عیبادەت فەلسەفەی عومرە هەتاکوو ماوی وریا بە**
**خەریکی تەزکیەی نەفس و ڕەفیقی ئەهلی تەقوا بە**

"سەباح بەرزنجی"

"مەزڵوم" لە وەسفی مەیخۆراندا دەڵێت:

**لە حاڵی مردن گەلێ بێحاڵن**
**تاڵبی هەوا و نەفس و خەیاڵن**

"مەزڵوم"

"عاصی" لە شەوی قەدردا واعیزانە دێتە مەیدان و دەڵێت:

**واز بێنە تۆ ئیمشەو لە خەوی غەفڵەت و مەستی**
**نەفست وەکوو دوژمن لەگەڵت وا لە قیتالا**

"عاصی"

"عاصی" بەدەم نزا و پاڕانەوە لە قاپیی پەروەردگاردا دێتە گۆ و داوا دەکات نەکەوێتە ژێر ڕکێف و دەستی نەفسی خۆی.

**مەمکە ژێردەست و ئەسیری نەفس و شەیتانی لەعین**
**غەرقی گێژاوی عەزابی ئاگری "لظی"م مەکە**

**ئیتر قەت مەیدە دەست نەفست لغاوی ئیختیاری خۆت**
**چە ڕێی چاکت نیشان نادا ئەمە هەر نەسسی قورئانە**

"عاصی"

"عاصی" لەبەردەم شێخەکەی کە بە مورشیدی خۆی زانیوە، ئەمەی وتووە:

**وەرە ئەی دڵ موهەییابە ئەوا نووری هیدایەت هات**
**بڕۆ ئەی نەفسی ئەممارە شەهنشاهی ویلایەت هات**

"عاصی"

لێرەدا "عاصی" دەیەوێت بڵێت "خووی شیری، هەتا پیری"، ئەمیش کە بەدوای داوی نەفس و شەیتان کەوتووە و لە گەورەییشدا منداڵانە گوێ بە هەندێک کرداری خراپ نادات.

**وا کەمەربەستەی ئیتاعەی نەفس و شەیتان بووم مودام**
**بۆیە ئێستاش وەک منداڵیم غەفڵەتە هەر عادەتم**

"عاصی"

"عاصی" عیرفانییانە دەگەڕێتەوە بۆ ناو خۆی و قسە لەگەڵ زاتی پەنهانی خۆی دەکات و بە خۆی دەڵێت وەرە مەردی خودا بە و بەهیواوە بجەنگە لەگەڵ نەفسی پیسی وەک بەراز، ئیدی ئەم کۆشان و جەنگسازییە کاری ئەهلی عیرفانە.

**ئەبێ هیوات ڕەزای حەق بێ وەرە "عاصی" بەمەردانە**
**لغاوی کە نەفسی سەرکێشت بەرازێکە لەناو لانە**
**لە مەیدانی شەڕی ئەودا چەکت هەر زیکری باری بێ**
**کە چونکە کوشتنی نەفسی جیهادی ئەهلی عیرفانە**

"عاصی"

"هەڵمەت عوسمان" بە هەناسەیەكی بانگخوازانەوە ڕوو دەكاتە نەفس و لە بەرامبەریدا هەڵوەستە وەردەگرێت. دەڵێت:

**ئەی نەفسی بەدخوو بەسە ئەم مەكرە**
**دەسا بیر كەوە كەی ئەمە زیكرە**
**نوێژی بەیانیت تەواوەی بەفرە**
**نوێژی نیوەڕۆت نزیكی عەسرە**

"هەڵمەت عوسمان"

"زەینەب خانی مەلا ڕەئووف" باس لە فەلسەفەی مەرگ و ژیان دەكات، وەسفی نەفس دەكات كە چۆن مرۆڤ دەكاتە بەندەی خۆی.

**بیر بكەوە ژیان چییە و مردن چی**
**بیر بكەوە بۆچی گۆڕە پەناگەت**
**ئەو نەفسەی كە تۆی كردە بەندەی خۆی**
**هەڕاجت دەكا بۆ یەك خەندەی خۆی**

"زەینەب خان"

كۆتایی ئەم نووسینە بەم شیعرە (ڕەها - ئازاد)ەی "زەینەب خان" دەهێنم كە تیایدا ئەم پەیوەندییەی نێوان نەفس و ڕۆح دەنووسێتەوە و نەفس بە دووپشكی ژەهراوی و ماری قێزەون ناو دەبات و دەڵێت:

**ڕۆحم بە نەفسم دەڵێ**
**خودا هیدایەتت بدا خودا**
**ڕۆحم**
**بە نەفسم دەڵێ**

بمرە
مەمخەرە زەلزەلە
ئەی دووپشکی ژەهراوی
ئەی ماری قێزەون
ئەی نەفسی بەدشووم
بمرە... بمرە...
توو خوا بمرە

"زەینەب خان"

# سەرچاوەکان

١. تیشکێ لە قورئانی پیرۆز، وەرگێڕانی: ئیبراهیم مەردۆخی، چاپی یەکەم، ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا، ٢٠١١.
٢. جیهانبینیی پیرەمێرد، م. عومەر ئیسماعیل، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٨.
٣. گوڵستانی ئیرەم لە وەصفی فەخری عالەم، ئامادەکردنی: عوسمان سەنگاوی، چاپی یەکەم، ٢٠١٨.
٤. ڕۆحی حیکمەت و نووری عیرفانی مەحوی، تەحسین حەمە غەریب، چاپی یەکەم، ناوەندی ڕێنوێن، ٢٠١٩.
٥. خۆناسیی عیرفانی و خواناسیی عیرفانی، د. حەمید ئینزامی، وەرگێڕانی: فاتیمە محەمەد زەڵمی، چاپی یەکەم، خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما، ٢٠١٨.
٦. دەروازەی شیعرناسین، جەمال بێدار، چاپی یەکەم، چاپخانەی نارین، ٢٠١٢.
٧. الفوائد المجموعة في الاحادث الموضوعة، امام محمد بن علي الشوكاني، چاپخانەی دار الكتب العلمية في بيروت – لبنان، ١٩٩٥.
٨. دیوانی نالی، لێکدانەوەی: م. مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و محەمەدی مەلا کەریم و فاتیحی مەلا کەریم، چاپی پێنجەم، چاپخانەی انتیشارات کردستان، ٢٠٠١.
٩. دیوانی سالم، لێکدانەوەی: م. مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و محەمەدی مەلا کەریم و فاتیحی مەلا کەریم، ئامادەکردنی: سدیق ساڵح، چاپخانەی بنکەی ژین، ٢٠١٥.
١٠. دیوانی کوردی، لێکۆڵینەوەی: مەحەمەد مستەفا حەمەبۆر، چاپی یەکەم، چاپخانەی دەزگای ئاراس، ٢٠١٠.
١١. دیوانی مەحوی، لێکدانەوەی: م. مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و محەمەدی مەلا کەریم، چاپی سێیەم، چاپخانەی انتیشارات کوردستان، ١٣٨١ی هەتاوی.

١٢. دیـوانی وەفـایی، لێكدانـەوەی: محەمـەد سـەعید نـەجاری (ئاسـۆ)، چـاپی سێیەم، چاپخانەی انتشارات كوردستان، ١٣٨٩ی هەتاوی.
١٣. دیوانی مەولەوی، وەرگێڕانی لە هەورامییەوە بۆ سۆرانی: محەمەد ئـەمینی ئەردەڵانی، پێداچوونەوەی: گۆران عەباس، چاپی یەكەم، چاپخانەی مەهارەت – نەشری ئیحسان، ٢٠٠٨.
١٤. دیـوانی نـاری، لێكدانـەوەی: عوسـمان عـارف نـاری زادە، چـاپی دووەم، چاپخانەی چوارچرا، ٢٠١٤.
١٥. دیـوانی حەمـدی، لێكدانـەوەی: عەبـدوڵڵا خـدر مـەولوود، چـاپی سـێیەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیریی هەرێمی كوردستان، ٢٠٠٨.
١٦. دیوانی حاجی قادری كۆیی، لێكدانەوەی: سەردار حەمید میران و كەریم شارەزا، چاپی دووەم، چاپخانەی انتشارات كوردستان، ١٣٩١ی هەتاوی.
١٧. دیوانی زەینەب خانی مـەلا ڕەئووف (كچـە كورد)، ئامادەكردنی: حیكمـەت حەمید مەلا ڕەئووفە فەندی، چاپی یەكەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، ٢٠١٨.
١٨. دیـوانی حـەریق، ئامـادەكردنی: سـەیید نەجمـەدین ئەنیسـی، چـاپی یەكـەم، چاپخانەی بینایی، ٢٠١٢.
١٩. دیـوانی شـێخ ڕەزای تاڵـەبانی، كۆكردنـەوە و سـاغكردنەوەی: شـێخ مەحەمەدی خاڵ و ئومێد ئاشنا، چاپخانەی كوردستان، ٢٠١٣.
٢٠. دیـوانی صـابری، سەرپەرشـتیاری چـاپ: عەبدولجـەبار بـەرزنجی، چـاپی چوارەم، چاپخانەی تەژی، ٢٠١٧.
٢١. دیـوانی ڕاجـی، ئامـادەكردن و سـاغكردنەوەی: د. عوسـمان دەشـتی و ئیسماعیل ڕاجی، چاپی یەكەم، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، ٢٠١١.
٢٢. دیـوانی بێكـەس، ئامـادەكردنی: محەمـەدی مـەلا كـەریم، چـاپی دووەم، چاپخانەی الادیب، ١٩٨٠.
٢٣. دیـوانی صـەیدی، لێكدانـەوەی: محەمـەد ئـەمین كـاردۆخی، چاپخانـەی انتشارات كوردستان، ١٣٨٥ی هەتاوی.

٢٤. دیـوانی وەلـی دێوانـە، وەرگێڕانـی لـە هەورامییـەوە بـۆ سـۆرانی: ڕازی، چاپخانەی انشارات کوردستان، ١٣٨٧ی هەتاوی.
٢٥. دیـوانی هـێمن، ئامـادەکردنی: وریـا زراری، چـاپی یەکـەم، چاپخانـەی کوردستانی ئازاد، ٢٠١٢.
٢٦. دیوانی نەدیم، ئاراس یاوەر (نەدیم)، چاپی یەکەم، چاپخانەی تەژنە، ٢٠١٩.
٢٧. دیـوانی سـافی هیرانـی، پێداچوونـەوەی: ئارمـان کـەریمی، چـاپی یەکـەم، چاپخانەی فەرهەنگ سەرای هونەر و ئەندێشە، ٢٠١٦.
٢٨. دیوانی ئەوڕەحمان بەگی بابان، ئامادەکردنی: مەلا مەحموودی گەلاڵی، چاپی دووەم، چاپخانەی دەزگای تیشک، ٢٠١٧.
٢٩. دیوانی سەید تاهیر هاشمی، ئامادەکردنی: عەبدولڕەحمان أشکوە، چاپی یەکەم، چاپخانەی انتشارات کوردستان، ٢٠١٩.
٣٠. دیوانی موفتی پێنجوێنی، ئامادەکردنی: ئومێد ئاشنا و کامیل عەبدوڵلا کەریم، چاپی دووەم، چاپخانەی ئەندێشە، ٢٠١٦.
٣١. دیـوانی بێخـود، ئامـادەکردنی: محەمـەدی مـەلا کـەریم، چـاپی دووەم، چاپخانەی انتشارات کوردستان، ١٣٨٦ی هەتاوی.
٣٢. دیـوانی ئەحمـەدموختار جـاف، عیـزەدین مسـتەفا ڕەسـول، چاپخانـەی پەنجەرە لە تاران، ٢٠١٨.
٣٣. دیـوانی قـانع، کۆکردنـەوەی: بورهـان قـانع، چـاپی هەشـتەم، چاپخانـەی دالاهو، ٢٠١٦.
٣٤. دیـوانی تـاهیر بـەگی جـاف، کۆکردنـەوە وئامـادەکردنی: حەسـەن گـۆران، چاپی دووەم، چاپخانەی دەزگای ڕۆشنبیری گۆران، ٢٠١١.
٣٥. دیوانی سەلام، ئامادەکردنی: ئومێد کاکە ڕەش، چاپی دووەم، چاپخانەی الحوادث –بغداد، ١٩٩١.
٣٦. دیوانی زەبیحی، ئامادەکردن و لێکۆڵینەوەی: سەید نەجمەدین ئەنیسی، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، ٢٠١٣.

٣٧. دیوانی سەیید کامیلی ئیمامی (ئاوات)، ئامادەکردن و لێکۆڵینەوەی: سەیید نەجمەدین ئەنیسی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕەهرەو مەهاباد، ١٣٨١ی هەتاوی.
٣٨. دیوانی مەدهۆش، ئامادەکردنی: محەمەدی مەلا کەریم، چاپی یەکەم، چاپخانەی علاء، بغداد، ١٩٨٢.
٣٩. دیوانی عاصم، لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەی: د. کەمال مەعرووف، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆشبیری، ٢٠١٢.
٤٠. دیوانی هەیبەت، ئامادەکردنی: سەباح حسەینی، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی، ٢٠١٣.
٤١. دیوانی ناتیق، لێکدانەوەی: حەکیم مەلا سالح، چاپی یەکەم، چاپخانە چوارچرا، ٢٠٠٩.
٤٢. دیوانی شڵماشی، ئامادەکردنی: سەلاحەدین عەبدولقادر واعیظ، چاپی یەکەم، چاپخانەی چوارچرا، ٢٠١٨.
٤٣. دیوانی عاصی، ئامادەکردنی: عەزیز گەردی، چاپی دووەم، لە چاپکراوەکانی نووسینگەی تەفسیر، ٢٠١٩.
٤٤. دیوانی مەزلوم، ئامادەکردنی: ئومێد کاکەڕەش، چاپی دووەم، چاپخانەی ئۆفسێتی کارۆ، ٢٠١٥.
٤٥. دیوانی دڵدار، ئامادەکردنی: ڕەمەزان حەمەدەمین و سەنگەر نازم، چاپی یەکەم، چاپخانەی تاران، ٢٠١٩.
٤٦. دیوانی زێوەر، ئامادەکردنی: مەحموود زێوەر، چاپی یەکەم، دەزگای ئاراس، ٢٠٠٣.
٤٧. دیوانی حەیدەری، ئامادەکردنی: شێروان حەیدەری، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠٠٠.
٤٨. دیوانی ویسالی، ئامادەکردنی: جەمال محەمەد، چاپی یەکەم، چاپخانەی الجاحظ – بغداد، ١٩٨٥.

٤٩. دیوانی ئەدەب، کۆکردنەوە و ساغکردنەوەی: محەمەد حەمەباقی، چاپی یەکەم، چاپخانەی دەزگای ئاراس، ٢٠٠٥.
٥٠. دیوانی بێسارانی، ئامادەکردنی: نیک رەفتار، چاپخانەی بەغداد، ١٩٨٢.
٥١. دیوانی پاکی، ئامادەکردنی: بورهان سەیید گوڵ، چاپی یەکەم، ٢٠٠٤.
٥٢. فڕین بەرەو ناسنوور، نووسینی: هێمن مام نادر، چاپی یەکەم، ٢٠١٤.
٥٣. پشت لە نەوا و ڕوو لە کڕێوە، نووسینی: عەبدوڵڵا پەشێو، چاپی سێیەم، چاپخانەی هێڤی، ٢٠٠٨.
٥٤. ماڵپەڕی ئاڵەکۆک
٥٥. ماڵپەڕی ڤەژین بوکس
٥٦. ماڵپەڕی الاسلام سؤال و جواب
٥٧- مركز الاشعاع الاسلامي لدراسات والبحوث الاسلامية.
٥٨. ماڵپەڕی Islam٤u.com

## پێڕست